

# خۆت ڕزگاربکە، نەک دنیا

مەسعود لەعلی ـ فەهیمە ئەرژەنگی

## خۆر ڕۆژ دروست دەکات ئێمەش ڕۆژگار ٣

**کۆمەڵە چیرۆکێکی تازە بۆ ئەزموونی پێگەیشتنی دەروونی و گەشەکردنی خود،**
**بۆ زاڵبوون بەسەر تاریکییەکاندا، پێش هەموو شتێک چرای دڵت داگیرسێنە**

وەرگێرانی: بەرهەم ناودەشتی

خۆر ڕۆژ دروست دەکات ئیمەش ڕۆژگار ٣

# خۆت ڕزگاربکە نەك دنیا


نوسینی: مەسعودی لەعلی

وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی



چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٤٨١)**

## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: **خۆت ڕزگاربکە نەک دنیا**
- نوسینی: مەسعود لەعلی
- وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی
- بابەت: چیرۆکە ڕەوشتییەکان، ڕێو ڕەسمی ژیان.
- بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١١٧٦)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**


ناونیشان:

سلێمانی ــــ بازاڕی سلێمانی ــــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧ ١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێرست

# نابینا و سێ ڕێبوار

کابرایەکی نابینا لەژێر درەختێکدا دانیشتبوو، پاشایەك هاتە لای، ڕێزی نواند و وتی: (قوربان، لە چ ڕێگەیەکەوە دەتوانین بچینە پایتەخت؟) دوای ئەو، سەرۆك وەزیرانی هەمان پاشا هاتە لای ئەم نابینایە و بەبێ نواندنی ڕێز وتی: (کابرا، ئەو ڕێگایەی کە بەرەو پایتەخت دەڕوات کامەیە؟) پاشان پیاوێکی ئاسایی هاتە لای ئەو، زەبرێکی لە سەریدا و پرسی: (گەمژە، ئەو ڕێگایەی کە بەرەو پایتەخت دەڕوات کامەیە؟)

پاشا و یاوەرانی ڕێگەیان بزر کردبوو. کاتێك کە هەموویان لەو پیاوە نابینایە دوور کەوتنەوە، ئەو دەستیکرد بە پێکەنین، ئەو پیاوەی کە لەلایەوە دانیشتبوو، لێی پرسی: (بۆچی پێدەکەنیت؟) نابیناکە وەڵامی دایەوە: (یەکەمین کەس کە پرسیاری لێم کرد پاشا بوو، کەسی دووەم سەرۆك بوو و کەسی سێیەم تەنیا پاسەوانێکی سادە بوو) پیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە لە نابیناکەی پرسی: (چۆن زانیت؟ ئەی تۆ نابینا نیت؟) نابینا لە وەڵامدا وتی: (لە ڕەفتاریانەوە...پاشا متمانەی بە مەزنایەتی خۆی هەبوو و بۆیە ڕێزی نواند...بەڵام پاسەوانەکە ئەوەندە بەدەست سوکی و نزمی خۆیەوە دەیناڵاند کە تەنانەت لێیدام. ئەو حەتمەن لە ژیاندا ئازاری زۆری چەشتووە رووبەڕووی گرفت و کێشەی زۆر بووەتەوە).

، مرۆڤـەکان حـەزیان لـە فەرمانڕەوایيـە، چـونکە
دەترسـن، بڕوابـەخۆبوونیان نییـە و متمانـەیان بـە
خۆیان نییە.

# سیاسەتمەدار و سێ ڕەشپێست

سیاسەتمەدارێکی پایەبەرز، سەروەختێك کە پاڵێوراوی پۆستێکی گرنگ بوو، بە سـێ ڕەشپێسـتی وت ئەگـەر هەریەکـەیان هۆکارێـك بـۆ کۆمـاریخوازبوونی خـۆی بخاتەڕوو ئەوا قەڵێکی قەڵەوی ئەداتێ. یەکەمیان وتی: (من بەو هۆیە کۆماریخوازم کە حکومەتی ئێمە ئازاری ڕەشپێستان ئەدات). سیاسەتمەدارەکە وتی زۆر باشە.

پاشان داوای لە دووەمیان کرد کە بۆچوونی خۆی بڵێت. (باشـە مـن لەبەرئـەوە کۆمـاریخوازم کـە دەوڵـەت بـۆ پشـتگیری لـە پیشەسـازییەکانی نـاوخۆ، گـومرگی قورسی بۆ کاڵا هاوردەکراوەکان پەسەند کردووە).

سیاسەتمەدارەکە وتی: (زۆرباشە) و پاشان داوای لـە بۆچـوونی کەسـی سـێیەم کرد. لەکاتێکدا کە سەری دەخوراند وتـی: (مـن کۆمـاریخوازم چونکە ئـەو قەلـەم دەوێ).

هەندێ لە مرۆڤەکان لە ترسەوە یـان چاوچـنۆکییەوە بیروباوەڕیـان دەردەبـڕن، نەك لە ئاگایی یان خۆشەویستییەوە.

# ئەمەش تێپەڕێت.......

ئاهەنگێکی گەورە لە وڵاتی چین بەرپا کرابوو و خەڵکێکی زۆر تیایدا بەشدار بوون، لە کەناری شارەکەدا بیرێکی بێ دیوار و پەرژین هەبوو کە بووەهۆی ئەوەی کە پیاوێك بکەوێتە ناوی. پیاوەکە دوای ئەوەی تێگەیشت کە چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە، دەستیکرد بە هات و هاوار و داوای یارمەتی کرد، بەڵام بەهۆی دەنگەدەنگی زۆری ئەو خەڵکەی کە کۆ ببوونەوە، هیچ کەسێك گوێی لە دەنگی نەبوو. پاش ماوەیەك، ڕاهیبێکی بودایی کە تینووی بوو هاتە سەر بیرەکە. سەیری ناوەوەی کرد، پیاوێکی بینی کە کەوتووەتە ناویەوە و یارمەتی دەوێ.

ڕاهیبەکە بە کابرای وت: هیچ کەسێك ناتوانێت، ئەویتر ڕزگار بکات). بودا وتوویەتی: (وەکو چرایەك ڕێگای خۆتان ڕۆشن بکەنەوە...ڕزگارکردنی ئەوانیتر مەحاڵە. چاوەڕێی کەس مەبن تا ڕزگارتان بکات). سەرەڕای ئەمەش، بودا وتوویەتی هەموو کەسێك ئەنجامەکانی کردارەکانی خۆی تەحەمول بکات. حەتمەن تۆ لە ڕابردوودا گوناهت ئەنجام داون کە دەبێ بەرگەی ئەم ڕەنج و نارەحەتییە بگریت، بۆیە زۆر دەنگە دەنگ مەکە و ئارام بە).

پیاوی ناو بیرەکە وتی: (سەرەتا من ڕزگار بکە، پاشان گوێ لە ئامۆژگارییەکانت دەگرم، لە ئێستادا گوێگرتن لە قسەکانی تۆ بۆ من ئەستەمە).

راهیب چیتر گوێی پێنەدا و درێژەی بە ڕێگاکەیدا، چونکە بودا وتبووی: (بەهیچ شێوەیەك دەست وەرمەدەرە کاروباری ئەوانیتر).

راهیبێکی کۆنفۆشیۆسیش لە لای بیرەکەوە رەت دەبوو، گوێی لە دەنگی پیاوەکە بوو کە دەیگوت: (رزگارم بکەن خەریکە دەمرم، بۆچی کەس نایەتە هاوارم؟)

راهیبەکە سەری بردە ناو بیرەکە و وتی: (کۆنفۆشیۆس راست دەکات، ئەو وتوویەتی دەبێ هەموو بیرێك بە دیوار چواردەوری بگیردرێت. تۆ بەهیچ شێوەیەك نیگەران مەبە، ئێمە حەتمەن بزاقێك بونیاد دەنێین کە دەوراندەوری بیرەکانی وڵات بکاتە پەرژین، ئێمە حکومەت ناچار دەکەین ئەم کارە ئەنجام بدات).

پیاوەکە وتی: (بەڵام من تا ئەو کاتە حەتمەن لەژیاندا نەماوم، کوا ئەم کارە یارمەتیم ئەدات؟)

راهیبەکە لە وەڵامدا وتی: (لەم بارەیەوە تاکەکەس بەهیچ شێوەیەك گرنگ نییە، کەسەکان دێن و دەڕۆن، کۆمەڵگە گرنگە، تۆ دەتوانیت بەو ئارامی و ئاسودەییەوە بمریت کە ئەم رووداوە چیتر بەسەر ئەوانیتردا نایەت، کۆنفۆشیوس ریفۆرمیستێکی کۆمەڵایەتییە).

دوای ئەم راهیبە بانگخوازێکی مەسیحیش لای بیرەکەوە تێپەڕی. سەیرێکی ناو بیرەکەی کرد. ئەو پێش ئەوەی کە پیاوەکە قسەیەکی بەدەمدا بێت، جانتاکەی کردەوە و گوریسێکی لێ دەرهێنا– بانگخوازە مەسیحییەکان هەمیشە ئامادەی یارمەتیدانن– ئەو پیاوە گوریسێکی هەڵدایە ناو بیرەکە و

بە پیاوەکەی وت: (سەری گوریسەکە توند بگرە تاوەکو سەرتخەمە سەرەوە). کاتێك پیاوەکە لە بیرەکە هاتە دەرەوە، کەوتە سەر پێیەکانی بانگخوازە

مەسیحییەکە. سوپاسی کرد و وتی: (بە راستی تۆ دینداریت، تاوەکو ئێستا کەسێکی وەکو تۆم نەبینیبوو).

بانگخوازە مەسیحییەکە لە وەڵامدا وتی (هەڵە مەکە، عیسای مەسیح فەرموویەتی تا ئەو کاتەی کە کەمترین و بچوکترین بەندەی خودا نەبیت، ناتوانیت بچیتە ناو مەلەکوتەکەیەوە. خزمەتکردنی ئەوانیتر، جۆرێك لە هەوڵ و پرۆڤەی مەعنەوی. تاکە رێگەی گەیشتن بە بەهەشت خزمەتکردنە. بۆیە چەندەی دەتووانی، بکەوەرە ناو بیرە جیاجیاکانەوە. چونکە من تاکەکەس نیم کە تۆ رزگار بکات، تەنانە منالەکانیشت فێر بکە بکەو ناو بیرەوە تاوەکو بانگخوازانی مەسیحی بتوانن بایی پێویست خزمەت بکەن. بە پێچەوانەوە چۆن چۆنی دەتووانین بچینە ناو بەهەشتەوە!)خزمەتکردنی بەم شێوەیە، لە خۆپەرستی و چاوچنۆکییەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە تاکی خزمەتگوزار هەست دەکات کەسێکە ولەبەرئەوەی کارێکی ئەنجامداوە، دەبێ خۆی لەوانیتر بەرزتر ببینێت، ئەو هەوڵ دەدات بتانگۆرێت و وەکو هەویرێکی تۆ لە شێوەی خۆی دروست بکات. ئەو کەسانەی کە بەدوای ئەو جۆرە خزمەتەوەن زۆر مەترسیدارن، چونکە ئامادەن هەموو کارێك بۆ ئێوە ئەنجام بدەن تاوەکو رێگەیەك بەرەو بەهەشت بۆ خۆیان واڵا بکەن. بەمشێوەیە تۆ دەبیتە ئامرازێك و ئەمە نائەخلاقیترین کارە کە لەم جیهانەدا

ئەنجامی بدەیت، واتە گۆڕینی ئەوانیتر بۆ ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆت...

ئەگەر توانای ئەو کارەت هەیە کە هەرچییەکت هەیە لەگەڵ ئەوانیتردا بەشی بکەیت و هاوبەش بیت، ئەم کارە بکە، بەڵام لەبەرانبەردا چاوەڕێی هیچ پاداشتێك مەبە و هیچ چاوەڕوانییەکەت نەبێت لەوەی کە کەسی بەرانبەر بگۆڕیت. پاشان تۆ

خۆت بە هیچ شێوەیەك بوونت هەیە تا ئەوانیتر بگۆڕیت؟ تەنیا ئەگەر ئەتوانیت یارمەتیدەر بە و هاوکار بە، بەڵام لەبەرانبەر یارمەتییەکەی خۆتدا چاوەڕوانی هیچ مەبە. بە پێچەوانەوە بەناوی خزمەتی دین و ئایینزاوە هە ئەو کەسە خۆپەرست و چاوچنۆکەی پێشوو دەبیت کە هەمیشە بیر لە بەکاربردنی ئەوانیتر دەکاتەوە.

خۆپەرستنەبوون بەشێوەیەکی راستەقینە ئەو کاتە روودەدات کە ئیتر هیچ منەتێك بوونی نەبێ. ئیشکردن بە منەتکردن یەکسانە بە خۆپەرستی، لەکاتێکدا کە خزمەتکردن بەوانیتر واتە نەبوونی خۆپەرستی.

خاکیبوونێکی راستەقینە، نەبوونی هەموو جۆرە منەتێکە. بۆ گەیشتن بەم قۆناغە دەبێ دەرك بە بوونی خۆت بکەیت بەبێ هیچ منەتێك، بۆ نموونە تۆ خواپەرستی دەکەیت، بەڵام ئەم خواپەرستییە هیچ چاوەڕوانییەکی بەدواوە نییە، تۆ خواپەرستی دەکەیت چونکە خۆشی لە خواپەرستییەکەت دەبینیت، خۆشەویستی دەکەیت، بەڵام خۆشەویستییەکەت بەتاڵە لە هەموو جۆرە چاوەڕوانییەك. ئەم خۆشەویستییە بە تەواوی خۆڕسك و سروشتییە.

کاتێك هیچ منەتێك نەبێت، هەرشتێك کە بیکەیت خۆپەرستی تیا نابێت، لەبارێکدا کە بە هەبوونی منەت تەنانەت ئەگەر هەزار و یەك کاری بە رواڵەت چاکیش ئەنجام بدەیت، هەست دەکەیت کە لە هیچت کەم نییە.

لەوانەیە ساڵانێك خواپەرستی بکەیت، بەڵام دیسان هەست بکەیت شتێك بزرە، رێك وەکو دانیشتنێکی مارەبڕی کە هەموو میوانەکان هاتوون. خۆراك و هەموو پێداویستییەکان بێ کەموکوڕی ئامادەکراون، بەڵام بوك و زاوا لەوێ نین.

ئەگەر منەت لە بوونی تۆدا نەمێنێت، رێك وەکو ئەوە وایە کە بوك و زاوا لە دانیشتنی مارەبڕییەکەدا ئامادەییان هەبێت. لەوەی کە ئێستا هەیت بەتاڵ بەرەوە تاوەکو پاکێتی لە تۆدا بێتە کایەوە.

# وشەی (کورسی)، هەر خودی کورسی نییە

مامۆستای گەورە هەموو قوتابییەکانی بانگ کرد تاوەکو (هایکی) بۆ کردنەوە و بەڕێوەبردنی قوتابخانەیەکی نوێ هەڵبژێرێت. ئەو دەفرە ئاوێکی گەورەی لەسەر زەوی دانا و وتی: (کێ دەتوانێ بڵێت ئەمە چییە، بێ ئەوەی کە ناوەکەی بەدەمدا بێت؟) قوتابییەکی گەنج کە پێدەچوو بەخت رووی تێکردبێت وتی: (کەس ناتوانێت ئەمە ناو بنێت پێڵاوی تەختە). قوتابییەکی تر وتی: (ناکرێ پێی بڵێیت بێژنگ، چونکە دەکرێ هەڵیگریت). شاگردی چێشتلێنەر کە لە لاوە وەستابوو هاتە پێشەوە، لەقەیەکی لە دەفرە ئاوەکەدا و خستی.

مامۆستای گەورە بزەیەکی هات و وتی: (قوتابی چێشلێنەر گونجاوترین کەسە بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەی قوتابخانەی نوێ). وشەی (کورسی) خودی کورسییەکە نییە. مامۆستا لە وەسفکردنی کورسیدا مۆڵەتی سوودوەرگرتن بە زمان نادات. قسە مەکە، بەڵام لەبارەی کورسییەوە شتێك بڵێ...سەخت! ئەقڵ تێکدەچێت، چونکە بەبێ بەکارهێنانی وشەکان هیچ نییە. ئەگەر زمان بەند بکەین، ئەقڵمان فەرامۆش کردووە. ئەقڵ جگە لە مشتێك وشە و رستە و زمان هیچی تر نییە؟

مامۆستا دەڵێت: (بەبێ بەکارهێنانی زمان) مەبەستی زمانی ئەقڵە. بەمشێوەیە، مامۆستا دەیەوێ سەرنجمان بەلای رووپۆشی زمانمان رابکێشێت. زمان رووپۆشی واقعیەتە. زمان، واقعیەت بە دڵی خۆت تەفسیر

دەكـات. زمـان دۆزەرەوەی واقیـع نییـە، خولقێنەریـەتی، بـەڵام بـە شـێوازی خۆی...

وشەی (خودا)، خودا نییـە. وشـەی (مـرۆڤ) مـرۆڤ نییـە و وشـەی (گـوڵی سـور) گوڵی سور نییە، گوڵی سوور بەبێ ئامادەیی وشەكان بوونی هەیە.

كاتێك رووپۆشی وشەكان لادەچێت، درەخت بوونێكی راستەقینەی خۆی پەیدا دەكات. راستییەكان سەربەخۆ لە ئێمە بوونیان هەیە.

# پەند

پیاوێك تەلەفۆنی بۆ هاوسەرەکەی کرد و وتی: (یەکێك لە هاوڕێکان ن هاتووەتە شار، دەمەوێ بۆ نانی ئێوارە بیهێنمە ماڵەوە). هاوسەری ئەو پیاوە لە پشت تەلەفۆنەکەوە هاواری کرد: (گەمژە، باش دەزانیت کە خزمەتکارەکەمان لە ماڵەوە نییە، مناڵەکە خەریکە ددانی دێت و بەردەوام نارەحەتە، منیش سێ ڕۆژە تام لێیە). پیاوەکە بە ئارامی و خوێنساردییەوە وتی: دەزانم هەربۆیە دەمەوێ بیهێنمەوە ماڵەوە، ئاخر ئەم گەمژەیە دەیەوێ هاوسەرگیری بکات).

مامۆستا دەڵێت: (مرۆڤەکان بەم شێوازانەی خۆیان، ژیانیان کردووەتە شێتخانەیەکی گەورە، هەموویان تووڕەن. لەم شێتخانە گەورەیەدا هەموویان سەرقاڵی ئەنجامدانی کارن و هیچ کەسێك خۆشەویستی ناناسێت. خۆشەویستی لە کار بەرزترە. هەمووان پەیڕەوی لە مۆدێلێك دەکەن. هیچ کەسێك ئەفرێنەر نییە. ژیانی کەس پڕ نییە لە وزە و خەندە و خۆشەویستی. ئەو هەموو بێزاری و ژاکاوی بەهۆی ترسە لە ژیان. ئێمە لە ژیان دەترسین، چونکە ژیان زۆرداریيە. ژیان پێشبینی نەکراوە. ئێمە دەمانەوێ هەموو شتێك پێشبینی بکەین. بەم کارە ژیانێکی ئەفرێنەرانە لەناو دەبەین و لەبری ئەوە ئاسایش دەکڕین.

دەبێ لە گەمارۆی ترس بێینە دەرەوە. دەبێ بوێریی ژینمان هەبێت. ڕووپۆشی ئەقڵ بدڕێنین و پەلکەزێڕینەی شکۆمەندانەی ژیان ببینین.

هەر کە لە گەمارۆی ترس بێیتە دەر ئەوا لە بەندێتی کۆمەڵگە هاتوویتە دەرەوە. کۆمەڵگە ئەقڵ دروست دەکات و ئەقڵیش کۆمەڵگە. ئەقڵ و کۆمەڵگە وابەستەی یەکترین. دەبێ هەر شتێك کە ساختەیە و رووی ژیان دادەپۆشێت بەلاوە نێین. دەبێ واقیعی بین و ژیانی واقیعی ئەزموون بکەین. ئەم کارە سەخت و پڕ مەترسییە. ئێمە بۆ هێشتنەوەی دەمامکەکانی خۆمان و درێژەدان بەم یارییە گاڵتەجاڕییە باجێکی گەورە ئەدەین. حەیفە. ئەم هەموو وەبەرهێنانە بۆ هیچە، بۆ پوچییە، دەرەنجامەکانی خۆ بوون هەرچییەکە، قبوڵی بکە، خۆت بە و لە ئێستادا بژی. ئایندە بکەرە قوربانی ئێستا. پێش من و تۆش ملیاردەها مرۆڤی تر هاتوون و ژیانی خۆیان کردووەتە قوربانیی ئایندەی خەیاڵی و رۆیشتوون. ئێستا جگە لە تۆز هیچیان لێ بەجێ نەماوە. گەشبین بە.

ئەم ساتەوەختە سەراپای تۆ ئەگرێتەخۆی. هەموو ئیعتیبارەکان و وەهمەکان و ترسەکان و ڕاڕاییەکان بەلاوە بنێ و بڕۆ دەرەوە. نیگەرانی ئەنجامەکان مەبە، ئەنجامەکان خۆیان ئاگایان لە خۆیانە.

# راستەوخۆ بڕوانە مانگ

شەویکیان (ئەوحەدی کرمانی)ی شاعیری گەورە لە هەیوانی ماڵەکەیدا دانیشتبوو و بەسەر کاسەیەکی گڵدا چەمابووەوە. عارف گەورە (شەمس تەوریزی) لەویوە رەت دەبوو. سەیریکی ئەو شاعیرەی کرد و پرسیاری کرد، (چی ئەکەیت؟) ئەوحەدی لە وەڵامدا وتی: (سەیری ئەو مانگە دەکەم کە لەم کاسە ئاوەدا وینەدانەوەیەکی جوانی هەیە).

شەمسی تەوریزی شەمسی تەوریزی دەستیکرد بە پیکەنین و قاقا لیدان، شاعیرەکە هەستی بە نارەحەتی کرد. خەڵکیك هاتن و لە دەوری کۆ بوونەوە.

شاعیر پرسیاری کرد: (چیە مەسەلە؟ بۆچی ئەوەندە پیدەکەنی؟ گاڵتە بە من دەکەیت؟)

شەمسی تەوریزی وتی: (ئەوە تۆ گەردنت شکاوە! بۆچی راستەوخۆ لە مانگ ناڕوانیت؟)مانگ لیرەیە.

مانگی تەواو لە ئاسماندایە و ئەم شاعیرە دانیشتووە و لەناو کاسەیەکی ئاودا دەڕوانیتە وینەدانەوەی مانگ! لە تیکستە عەقیدەیی-خورافییەکاندا، دۆزینەوەی راستی واتە روانین لە مانگ لە کاسەیەکی ئاودا.

ئەگەر داوا لە کەسیکی تر بکەیت تا پیشانت بدات چۆن بژیت، داوای گومڕاکردن دەکەیت چونکە ئەویتر تەنیا دەتوانیت لەبارەی خۆیەوە قسە بکات.

دوو ژیان هەرگیز یەکسان نین. ئەو هەرچییەك بیڵێت و بیخاتەڕوو ئەوا لەبارەی ژیانی خۆیەوەیەتی، ئەویش ئەگەر خۆی پیایدا تێپەڕیبێت.

لەوانەیە ئەویش لە کەسێکی تری پرسیبێت و بە قەرز وەریگرتووە و خۆی تەنیا لاساییکەرەوە بووە، ئەو کاتە وێنەدانەوە لەناو وێنەدانەوەدا دەبێت.

چەندەها سەدە تێپەڕیووە و خەڵکی بەردەوام دەبن لە تەماشاکردنی وێنەدانەوەی وێنەدانەوە و لەکاتێکدا کە مانگی راستەقینە هەمیشە لە ئاسماندا چاوەڕێمانە. ئەمە مانگی تۆیە، راستەوخۆ تەماشای بکە. هیچ ئامرازێك بەکار مەهێنە، بۆچی چاوەکانی من و هی یەکێکی تر بە قەرز وەردەگریت؟ تۆش دوو چاوت پێدراوە، دوو چاوی جوان بۆ بینین و بۆ بینینی راستەوخۆ.

بۆچی تێگەیشتن لە یەکێکی تر وەردەگریت؟ بیرت بێت کە دەشێ ئەمە بۆ من تێگەیشتنێك بێت، بەڵام ئەو ساتەی کە وەریدەگریت، دەبێتە زانین بۆت و چیتر تێگەیشتنێك نابێ.

تێگەیشتن تەنیا بە ئەزموونی کەسی دێتە دی. دەشێ بۆ من تێگەیشتنێك بێت، ئەگەر من راستەوخۆ سەیری مانگم کردبێت، بەڵام ئەو ساتەی کە بۆ تۆی ئەگێڕمەوە، چیتر تێگەیشتن نییە. تەنیا قسەی زمانە و زمانیش درۆزنە.

# چیرۆکی دوو ئینگلیز

دوو ئینگلیز بە شەمەنەفەر سەفەریان دەکرد. شەمەنەفەرەکە وەستا و یەکێکیان دابەزی. لەکاتێکدا کە زۆر ڕەنگی پەڕیبوو و نەخۆش دیار بوو، هاوسەرەکەی هاتبووە پێشوازی. ژنەکە پرسیاری کرد: (چیت بەسەر هاتووە؟) پیاوەکە وتی: (هەر کاتێك کە دەبێ دانیشم، نابێ لە بەرانبەر ئاراستەی جوڵەی شەمەنەفەردا بێت، ئەگینا جەستەم وەکو مرۆڤی تا لێهاتوو دەلەرزێت).

هاوسەرەکەی وتی: (وا باشتر بوو شوێنەکەت بگۆڕیت تا نەخۆش نەکەویت).

پیاوەکە وتی: (ئەمویست ئەوە بکەم، بەڵام ئینگلیزێکی تر ڕووبەڕووم بوو).

ژنەکە وتی: (قەیچی ئەکرد، کێشەکەت بەو ئەگوت، ئەو گوێی ئەگرت، خۆ هەموو کەسێك ئەو کێشەیەی نییە).

پیاوەکە وتی: (ڕاست ئەڵێیت، بەڵام چۆن چۆنی ئەمتوانی شتێکی پێ بڵێم لەکاتێکدا کە کەس بەوی نەناساندبووم و ئەوەش بەبێ پێشەکی....)

ئەمە خاسیەتی ئینگلیز نییە، بەڵکو پەیوەندی بە دنیای بوونەوە هەیە، تۆ نەچوویتە ناویەوە، چونکە کەس پێی نەناساندوویت. کەس ئەو ئازایەتییەی بە تۆ نەبەخشیووە کە خۆت کەشف بکەیت. مرۆڤ چووەتە سەر مانگ، سەر لوتکەی ئێڤرست، هەسارەی مەریخ و ...بەردەوامە لە ڕۆیشتن بەرەو

پێشەوە بەبێ ئەوەی خۆی بناسێت. تا ئەو کاتەی کە چالاکی نەوەستێت– تەنانەت جوڵەی شەپۆلەکانی بیرکردنەوەش چالاکییە– ناتوانیت بوون بناسیت، چونکە چالاکی وەکو تۆزێکی بەربڵاو لە دەوری تۆدا دێت و دەچێت. بیروڕای بەرفراوان و هەستی بەرفراوان، حاڵەتە جیاوازەکان و.....بە دیوارێکی نەبینراو دەورە دراویت. بەڵام زۆر گەورەیە کە لەوانەیە بگاتە گەورەیی دیواری چین، ئۆتۆمبێل دەتوانێت بەسەریدا سەرکەوێت، چونکە وەکو پانتایی جادەیە، بەڵام نەبینراوە. تۆ بەدرێژایی ژیانی خۆت بەرگەی هەموو قورساییەکەی دەگریت، زۆر و زۆرتر رازئامێز دەبێت و نازانیت کە سروشتی بوون رازئامێز نییە.

رەمز و راز دەستکردی مرۆڤە، بوون چالاك و پڕ خرۆشە. وەکو ئاوازی سەمایەك و ئاهەنگی بەردەوامە بەدرێژایی ساڵ. کاتێك چالاکییەکە رابگریت، کاتێك ئاگایی خۆت لە ناوەندی تاکێتی خۆتدا کۆ بکەیتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە دەرگایەکی تر بە رووی دنیایەکی تردا دەکرێتەوە.

# لە رۆڵی ئەبراهام لینکۆڵندا

دنیا هاورێی کەسێکە کە بەشێوەیەکی نائاگایانە کاری خۆی دەکات و لەسەر شانۆ خەریکی نوواندنە. وایدابنێ لە شانۆنامەیەکدا رۆڵی عیسای مەسیح یان موسا دەبینیت. کێشەکە ئەو کاتە دێتە پێش کە بیرت دەچێتەوە خەریکی نواندنیت و کاتێك پەردەکە دادەدرێتەوە و دەچیتەوە ماڵەوە. وەکو مەسیح یان موسا رەفتار دەکەیت. هەندێ جار لەم جۆرە رووداوانە روودەدەن. جارێکیان ئەم رووداوە بەسەر کەسێك هات کە بە درێژایی ساڵێك رۆڵی ئەبراهام لینکۆڵنی نواندبوو. ئەو هەموو رۆژێك لەگەڵ گروپێکدا لە شارێکەوە دەچووە شارێکی تر و لە سیناریۆیەکی جێگیردا بە درێژایی ساڵێك ئەو رۆڵەی بینی. بیرکردنەوەی شپرزە بوو و دوای ساڵێك پێناسی راستەقینەی خۆی لەبیر چووەوە. ئەو لە هەموو شوێنێك دەیگوت ئەبراهام لینکۆڵنە. سەرەتا خەڵکی پێیان وابوو گاڵتە دەکات، بەڵام پەیتا پەیتا کارەکە جدیتر بوو. بە ناوی ئەبراهام لینکۆڵنەوە دەهاتەوە ماڵەوە. هاوسەرەکەی هەوڵی ئەدا قەناعەتی پێ بێنێت کە لەو رۆڵە بێتە دەرەوە. باوکیشی هەوڵی ئەدا تێیبگەیەنێت کە ئەبراهام لینکۆڵن نییە. بەڵام بێ فایدە بوو. ئەو وەکو ئەبراهام لینکۆڵن بە رێگەدا دەرۆیشت و بە تەتەڵەکردنەوە قسەی ئەکرد و قژی بە شێوازی ئەو شانە دەکرد. بە درێژایی ساڵێك ئەو کابرایە هەر خەریکی نوواندن بوو.

پاش ماوەیەك كار گەیشتە ئەوەی كەس و كاری ناچار بوون بیبەنە لای پزیشكی دەروونی. دەروونناسەكەش زۆر هەوڵیدا و هەموو ئامرازەكانی گرتە بەر، بەڵام كابرای هونەرمەند هیچی نەدەوت، جگە لەوەی كە: ئەوە چی ئەڵێیت؟ شێت بوویت؟ من ئەبراهام لینكۆڵنم.

هیچ رێگەچارەیەك نەبوو..ئەوان ئامێری ناسینەوەی درۆیان هەبوو كە لە دادگاكاندا بەكاردەهێنرا. كە كەسی مەبەست بێ ئەوەی بزانێ چی ئەگوزەرێ لەسەری رادەوەستا و ئامێرەكە وەكو كاردیۆگرامێك یان شتێكی لەو بابەتە ئیشی دەكرد.

ئامێری ناسینەوەی درۆ لێدانەكانی دڵ وەردەگرێت. ئەگەر لەكاتی قسەكردندا كەسێك راستییەكە بڵێت، هێڵەكان بە رێكی پیشان دەدات. بەڵام كاتێك لە بەینی قسەكاندا درۆ بكات ئەوا هێڵەكان بە خێچ و خواری دەردەكەون.

پزیشكە دەروونییەكە وتی ئەبراهام لینكۆڵن لەسەر ئامێرەكە بوەستێت. لەم بارەدا هەموویان دەیانتووانی تێبگەن ئایا ئەو درۆ دەكات یان نا. تاوەكو ئەو رۆژە هەموو جۆرە دەرمان و چارەسەرێك لەسەر ئەو كەسە تاقی كرابوونەوە كە خۆی بە ئەبراهام لینكۆڵن ناو دەبرد. كەسێك كە بانگەشەی زانست و پسپۆری دەكرد دەهاتە هانای. كابرای هونەرمەند كاتێك رووبەرووی ئەم گیروگرفتانە بووەوە، بە بیركردنەوە لە بەرژەوەندییەكەی دواجار بڕیاری خۆی دا. بەمشێوەیە پێی وابوو ئەگەرچی رۆژێك لە رۆژان ئەبراهام لینكۆڵن بووە، ئەوا باشترە بڵێت ئەمڕۆ چیتر ئەو نییە، لەبەرئەوەی كارەكە تەواو

ببوو. لەبەر خۆیەوە دەیگوت من كە لەناخی خۆمدا دەزانم كێم، بەردەوامبوونم لە كارەكەمدا سوودی نییە.. بەڵام دەبێ هەمان ئەو شتە بە خەڵكەكە بڵێم كە

دەیانەویێ. من دەڵێم ئەبراهام لینکۆڵن مرد. ئەگەر ئەوە نەکەم ئەوا ژیان بۆم سەخت دەبێت!

دواجار لە وەڵامی ئەوەدا کە تۆ ئەبراهام لینکۆڵنیت؟ ئەو وت: (نا!) ئامێری درۆ دۆزەرەوەکە لەو ساتەدا پیشانیدا کە ئەو درۆ دەکات. ئەو لە رواڵەتدا نەیدەویست نکوڵی لە بیروباوەڕی خۆی بکات، بەڵام لە قووڵایی بوونی خۆیدا هەر خۆی بە ئەبراهام لینکۆڵن لەقەڵەم دەدا. ئێستا ئەو درۆی لەگەڵ زمانی خۆیدا دەکرد.

ئەگەر شتێکی وەها بەسەر تۆدا بێت، ئەوا تۆ کەسێکی ژیاندۆستیت. ئەمە پێناسەی منە لە ژیاندۆست: کەسێك کە دەچێتە ناو رۆڵی خۆیەوە و بیری دەچێتەوە لێی بێتە دەرەوە. کەسێك کە لە بارودۆخێکی وەهادا دەمێنێتەوە، گیرۆدەی بووە. ئەم کابرایە ژیاندۆستە، بەڵام ئیماندار خوازیاری جیهانێکی ترە. ئەو لەسەر نواندنی رۆڵەکان بەردەوام دەبێت. بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەزانێت کە ئەمانە رۆڵن و هەرگیز گرفتاری هیچ خراپ تێگەیشتنێك نابێ.

رێبوار کاتێك دەگەڕێتەوە ماڵەوە وەکو مێرد و باوك و هاوسەر رەفتار دەکات. ئەمانە هەمووی گەمەن، کەواتە جوان گەمە بکەن، هونەرمەندانە یاری بکەن، بە زەوقێکی پڕاوپڕ لە تێگەیشتنی جوانی یاری بکەن. لەهەمان کاتیشدا نیازمەندی گرفتاربوون مەبن لە داوی رۆڵی وەکو باوك، دایك، پزیشك

ئەندازیار و هیتردا، ئەمانە هەمووی ئەرکن. کاتێك تۆ خەریکی چارەسەری نەخۆشییەکیت، دەبێ رۆڵی پزیشك ببینیت. کاتێك نەخۆشییەك لەئارادا نییە و بە تەنیا لە ژووردا دانیشتوویت، چیتر پێویست ناکات خۆت وەکو پزیشك ببینیت. ئەگەر سەرنج نەدەیتە ئەم خاڵە، وەکو ئەو کەسەیت کە خۆی بە ئەبراهام لینکۆڵن لەقەڵەم دەدا کە کارەکەی زۆر گەمژانە بوو.

# تۆڵە

ڕۆژێکیان سەگێکی بەرەڵا گازی لە سیاسەتمەدارێك گرت، بەڵام ئەو مەسەلەکەی بەجدی وەرنەگرت تا ئەوەی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ برینەکە خراپتر بوو.

سەرەنجام سیاسەتمەدارەکە چووە لای پزیشك. پزیشك دوای پشکنینی برینەکە فەرمانیکرد سەگەکەی بۆ بێنن. هەر بەو شێوەیەی کە پێشبینی کردبوو، سەگەکە نەخۆشی هاری هەبوو. ئێستا ئیتر بۆ لێدانی دەرزی و ڕێوشوێنی خۆپارێزی زۆر درەنگ ببوو. پزیشکەکە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەبێ نەخۆشەکە بۆ قۆناغی سەختتر ئامادە بکرێت.

سیاسەتمەدارەکە لە پشت مێزی پزیشکەکە دانیشت و دەستیکرد بە نووسین. پزیشکەکە بە میهرەبانی و دڵسۆزییەوە هەوڵیدا دڵی بداتەوە و وتی: (لەوانەیە ئەوەندەش خراپ نەبێ. پێویست ناکات وەها زوو وەسیەتنامە بنووسیت).

سیاسەتمەدارەکە لە وەڵامدا وتی: (وەسیەتنامە نانووسم، خەریکی نووسینی لیستی ناوی ئەو کەسانەم کە دەبێ گازیان لێبگرم).

(تۆ لە لیستەکەی خۆتدا ناوی چەند کەست نوسیووە؟)

یەکێك لە نیشانەکانی کەسانی ڕاستی خواز ئەوەیە کە ڕقیان لە کەس نییە. هیچ کەس بە دوژمنی خۆیان نازانن و لە هۆشی خۆیاندا تۆڵەیان بۆ کەس هەڵنەگرتووە.

# پاسەوانی کۆشك

هەموو نیوەشەوێك کاتێك هەموو شتێك ئارام و خامۆش بوو، دەچووە کەناراوێکی نزیك ماڵەکەی. ئەو راهاتبوو لەسەر ئەوەی کە لە کەناری رووبارەکە دانیشێت و بێ ئەوەی هیچ بکات، تەنیا رابمێنێتە ناو ناخی خۆی و ئەو لە ناخی خۆیدا ببینێت.

شەوێکیان لەبارێکدا کە خەریکی گەڕانەوە بوو بۆ ماڵ، کەسێکی دەوڵەمەند بەوێدا تێپەڕی. بە رێکەوت پاسەوانی ئەم کۆشکەش لەبەرانبەر دەرگاکە وەستابوو. زۆر شپرزە بوو، چونکە کتومت هەموو شەوێك لەو کاتەدا کابرا لەوێوە رەت دەبوو. پاسەوانەکە نەیتوانی خۆی بگرێت و پرسیاری کرد: (ببوورە کە سەر ئەکەمە سەرتان، بەڵام من چیتر ناتوانم خۆم بگرم و پرسیار نەکەم، ئەکرێ بپرسم کارتان چییە؟ بۆچی هەموو شەوێك دەچیتە کەناری رووبارەکە؟ چەندین جار تاوەکو کەناری رووبارەکە تێبینیم کردوویت و بەراستی سەرم سوڕماوە، چونکە تۆ بێ ئەوەی هیچ بکەیت، چەند سەعاتێك لە کەناری رووبارەکەدا دادەنیشیت و هەر لەو کاتەدا دەگەڕێیتەوە ماڵەوە).

پیاوەکە کە ناوی (رۆزبێ) بوو لە وەڵامدا وتی:

—هەر جارێك کە تۆ چاودێری منت دەکرد، ئاگاداری ئەم مەسەلەیە دەبووم چونکە شەو زۆر خامۆشە و من دەمتووانی گوێم لە دەنگی پێت بێت، بەڵام ئەوە

تەنیا تۆ نیت کە دەتەوێ لەبارەی منەوە بزانیت. منیش ئەمەوێ بزانم ئیشی تۆ چییەپاسەوانەکە لە وەڵامدا وتی:

—ئیشی من؟ پاسەوانێکی ئاساییم.

رۆزبێ وتی:

—ئای خوایە، تۆ بوویتە هۆی ئەوەی کە منیش بە ئیشی خۆم بزانم. منیش پاسەوانم.

پاسەوانەکە وتی:

بەڵام من تێناگەم، کاتێك تۆ لە کەناری رووبار دادەنیشیت، پاسەوانی چی ئەکەیت؟

رۆزبێ وتی:

—لە راستیدا جیاوازی هەیە لە نێوان من و تۆدا، تۆ پاسەوانی شتێکیت لە دنیای دەرەوەدا، بەڵام من پاسەوانی ناوەوەم و بەردەوام چاودێری دەکەم. من تەماشای (خۆم) دەکەم و ئەمە هەوڵێکە کە بە درێژایی تەمەن لەسەری بەردەوامم.

پاسەوانەکە وتی:

—بەڵام ئەمە ئیشێکی زۆر سەیرە ! کێ حەقدەستت دەداتێ؟

رۆزبێ لە وەڵامدا وتی:

—ئەم کارە خۆشی و چێژێکی پێشبینی نەکراوی هەیە و بەهیچ شێوەیەك پێویستی بە حەقدەست نییە. تەنیا ساتێکی ئەم خۆشییە، زۆر زیاتر لە هەموو گەنجینەکانی ئەم دنیایە بەنرخە.

پاسەوانەکە وتی:

—زۆر سەیرە. من بە درێژایی ژیانم پاسەوان بووم، بەڵام هەرگیز ئەزموونێکی وەهام نەبووە. سبەی شەو منیش لەگەڵتا دێم. تکایە فێرم بکە چۆن ئەم کارە بکەم. من دەزانم چۆن ئاگادار بم، پێم وایە تەنیا دەبێ ئاراستە و لای هۆشیاری و تەماشاکردنەکە بگۆڕدرێت.

مامۆستاکە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە: هەموو مەسەلەکە تەنیا یەك هەنگاوە و ئەو هەنگاوە گۆڕینی ئاراستەی ڕوانین و ڕەهەندەکانە. ئێمە یان ئەوەتا دەڕوانینە دنیای دەرەوە و یان دەتووانین چاوەکانمان لە دنیای دەرەوە دابخەین و ڕێگە بدەین هەموو هۆشمان بە ئاراستەی ناوەوەدا چڕ ببێتەوە. لە ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەدا، هۆشی ئێمە بە هەزار و یەك شتەوە قالبووی دنیای دەرەوەیە، تەنیا ئەوە پێویستە کە پەیوەندیی هۆشمان لەگەڵ دنیای دەرەوەدا ببڕین و ڕێگە بدەین خۆی پشوو بدات و ئارام بگرێت. بەمشێوەیەیە کە دەگەینە مەنزڵ.

# نازەنین یان گەمژە

(مەك گینی) لە سەرەمەرگدا بوو. بریکارەکەی هات تا وەسیەتنامەکەی رێکبخات. (بریژیت)ی هاوسەری زەمینەسازی کرد تاوەکو لەم مەراسیمە گرنگەدا بەشداری بکات. بریکارەکە وتی: (هەرچی زووە داواکارییەکانت بڵێ).

مەك گینی: (تیم ریلی چل دۆلار قەرزاری منە).

هاوسەرەکەی وتی: (ئەی جا چی؟!)

پیاوەکە وتی: (شیان ئونیل سی و حەوت دۆلار قەرزاری منە).

ژنەکە بە بزەیەکەوە وتی: (چەند پیاوێکی نازەنینە! تاوەکو دوایین سات راستگۆیە).

(دووسەد دۆلار قەرزاری میشل کالاهانم).

بە بیستنی ئەم قسەیە، ژنەکە هاواریکرد: (ئەی مریەمی پیرۆز! گوێت لێیە ئەم پیاوە شێتە چی دەڵێت؟!)

بارودۆخەکان دەگۆڕێن! کاتێك تۆ شتێکت بوێت، سوودی هەیە بۆت، کاتێك چاوەڕوانییەکانی تۆ مەیسەر بکات، بە تەواوی باشە: (چەند پیاوێکی نازەنینە! تاوەکو دوایین سات راستگۆیە). بەڵام دواتر: (مریەمی پیرۆز! گوێت لێیە ئەم پیاوە شێتە چی دەڵێت؟!) مێردەکەی شێت دەبێت!

سەرنج: ئێمەی مرۆڤ لەسەر بنەمای ئەو پەرژەوەندییانەی کە هەمانە، شتەکان و کەسەکان بەسەر نازەنین یان شێتدا دابەش دەکەین. هەر کاتێك ئەوان بە کردار و قسەکانیان سوودمان پێ بگەیەنن، کەسانی خۆشەویست و پەسەندن و کاتێك کە بە ئاقاری پەرژەوەندییەکانی ئێمە هەنگاو هەڵنەهێنن ئەوا گەمژە، شێت و بەدکارن..

# بەدوای ئارامیدا

پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند لە کۆتاییدا زۆر نائومێد بوو کە ئەنجامێکی سروشتی هەموو سەرکەوتنەکانە. هیچ شتێك وەکو سەرکەوتن بە کۆتایی ناگات. سەرکەوتن تەنیا کاتێك جێی سەرنجە کە مرۆڤێکی ناسەرکەوتوو بیت. هەر کە سەرکەوتوو بوویت، ئەو کاتە دەزانیت کە لەلایەن ئەم دنیاوە، لەلایەن خەڵکەوە، لەلایەن کۆمەڵگەوە لە خشتە براویت. ئەو پیاوە سامانێکی زۆری هەبوو، بەڵام ئاسودە نەبوو. بۆیە سۆراخی ئاسودەیی دەکرد.

هەموو ئەو کەسانەی خۆیان بە دانا لەقەڵەم دەدا، ئامۆژگاری کابرایان دەکرد، بەڵام هیچ کامیان کاریگەر نەبوو. سەرەنجام ئەو کەسەی کە تاوەکو ئەو رۆژە نەچووبووە لای و بەهیچ شێوەیەك دانا نەبوو- تەنانەت بە پێچەوانەشەوە بە گەمژەترین پیاوی گوند لەقەڵەم دەدرا- ئەوی لەسەر رێگا وەستاند و وتی: (بێهودە کات بەفیڕۆ دەدەیت، هیچ کام لەو کەسانە دانا نین، من ئەوان باش دەناسم. بەڵام تا ئەو جێیەی کە بە گەمژە ناسراوم، کەس باوەڕ بە قسەکانم ناکات. لەوانەیە تۆش باوەڕ بە قسەکانم نەکەیت، بەڵام من کەسی دانا دەناسم. کە تۆم بینی ئەوەندە لە ئازاری بەردەوام و هەوڵی دۆزینەوەی ئاسودەییدایت، پێم وابوو ئەگەر ئەو کەست پیشان بدەم ئەوا بەسوود دەبێ بۆت ئەگینا من کەسێکی گەمژەم و هیچ کەس ئامۆژگاری لە من وەرناگرێ و منیش هەرگیز ئامۆژگاری کەس ناکەم. بەڵام بەلامەوە قابیلی قبوڵ نەبوو کە تۆ بەو نارەحەتییە

ببینم، بۆیە بێدەنگیم شکاند. ئێستا تۆ بچۆرە سۆراخی ئەم پیاوەی گوندی دراوسێ).

کابرای دەوڵەمەند بە خێرایی و بە زەنبیلێکی گەورەی پڕ لە ئەڵماسی گرانبەهاوە بە سواری ئەسپەکەی بەرەو ئەو گوندە رۆیشت. ئەو پیاوە کابرای لە گوندەکە بینی. پیاوێکی خۆش مەشرەب بوو بەناوی مەلا نەسرەدین. لێی پرسی: (ئایا دەتوانیت بۆ بەدەستهێنانی ئاسودەیی یارمەتیم بدەیت؟ مەلا وتی: (یارمەتی؟ من ئەتووانم بتدەمێ). پیاوە دەوڵەمەندەکە بیری کردەوە، "چەنێك سەیرە. لەسەر پێشنیاری ئەو کابرا شێتە هاتوومە ئێرە کە لەوپەڕی نائومێدیدا بیرم لەوە دەکردەوە زیانی بۆم نەبێت. بەڵام ئێستا ئەبینم کە ئەم پیاوە لەو کابرایەی پێشوو شێتترە، چونکە ئەڵێ ئەتووانم بتدەمێ!)

کابرای دەوڵەمەند بە مەلای وت: (تۆ ئەتووانیت بمدەیتێ؟ من چوومەتە لای هەموو داناکان، ئەوان هەموویان وتوویان ئەمە بکە، ئەوە بکە. ژیانت رێکخە، کاری چاك ئەنجام بدە، یارمەتی هەژاران بدە، نەخۆشخانە دروست بکە و کاری جیاوازی تر ئەنجام بدە. ئەوان ئەم شتانەیان بە من وت و من بەراستی ئەو کارانەم ئەنجامدا ، بەڵام نەك تەنیا کەڵکیان بۆم نەبوو، بەڵکو کێشەکانم زیاتر و زیاتر بوون و ئێستاش تۆ دەڵێیت ئەتووانی بمدەیتێ؟!)

مەلا وتی: (ئەمە شتێکی ئاساییە. لە ئەسپەکەت وەرە خوارەوە).

کابرای دەوڵەمەند لەکاتێکدا کە زەنبیلەکەی خستبووە ژێر قۆڵی لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە. مەلا لێی پرسی: (چیت لەناو ئەو زەنبیلەدا هەیە کە بەو شێوەیە توند نوساندووتە بە سنگتەوە؟)

کابرا وتی: (ئەمانە ئەڵماسی گرانبەهان. گەر تۆ بتوانیت ئاسودەییم بدەیتێ ئەوا ئەم زەنبیلەت پێشکەش دەکەم). بەڵام پێش ئەوەی کابرا بێتە سەرخۆی،

مەلا زەنبیلەکەی لە دەست دەرهێنا و رایکرد. کابرای دەوڵەمەند بۆ چەند ساتێك شۆك بوو. نەیدەزانی چی بکات. بەڵام دواتر دەستیکرد بە راکردن بەدوای مەلادا. ئەوێ شوێنی ژیانی مەلا بوو و شارەزای هەموو کون و کوچەیەکی بوو و بەردەوام بوو لە راکردن. کابرای دەوڵەمەند زۆر قەڵەو بوو بە هەموو تەمەنی تەنانەت یەك جاریش راینەکردبوو...بەردەوام هاواری دەکرد، هەناسەبڕکێی بوو و فرمێسکی لە چاوان دەهاتە خوار. لەبەر خۆیەوە وتی: (من بە تەواوی فریوم خوارد! ئەم پیاوە ئاکامی هەموو رەنج و زەحمەتەکانم، هەموو داراییەکانمی برد. هەرچی هەمبوو نەمبوو بردی...)

خەڵکێکی زۆر بەدوایەوە بوون، هەموویان پێدەکەنین. پیاوەکە پێیانی وت: (ئەرێ ئێوە هەمووتان شێت بوون؟ لەبری ئەوەی کە دزەکە بگرن هەمووتان پێدەکەنن!)

خەڵك وتیان: (ئەو دز نییە، پیاوێکی زۆر دانایە).

پیاوە دەوڵەمەندەکە وتی: (پیاوێکی شێت لە گوندەکەی خۆمان منی خستە ناو ئەم دەردەسەرییەوە). و لەکاتێکدا کە هەر بەردەوام بوو لە رۆیشتن و عەرەقی لێ دەتکا سۆراخی مەلای دەکرد. مەلا دووبارە گەڕایەوە

ژێر ئەو درەختەی کە ئەسپی ئەو پیاوە لەژێریا بوو و هەر لەوێ دانیشت. پیاوە دەوڵەمەندەکەش بە ناڵە و هاوارەوە گەیشتە ئەوێ. مەلا پێی وت: (وەرە زەنبیلەکەت وەرگرەوە). پیاوە دەوڵەمەندەکە زەنبیلەکەی وەرگرتەوە و بە نوساندی بە سنگیەوە. مەلا وتی: (حاڵت چۆنە؟ هەست بە ئاسودەیی دەکەیت؟)

پیاوە دەوڵەمەندەکە وتی: (بەڵێ، هەست بە ئاسودەییەکی زۆر دەکەم. تۆ کابرایەکی سەیریت و شێوازێکی سەیرت هەیە!)

مەلا وتی: (شێوازێکی سەیر نییە، تەنیا کردارێکی ماتماتیکی سادەیە. تۆ هەموو ئەو شتانەی کە هەتە بە بەلگەنەویست و حاشاهەلنەگر ئەیبینیت: ئەبێ بارودۆخێك بێتەکایەوە کە لەدەستی بدەیت تاوەکو بەخێرایی تێبگەیت کە چ شتێکی بەنرخت لەدەست داوە. ئێستا تۆ هیچی تازەت بەدەستنەهێناوە. ئەمە هەمان ئەو زەنبیلە بوو کە بەبێ هیچ ئاسودەییەك پێت بوو. ئێستاش هەر ئەو زەنبیلەت لایە و هەر کەسێك کە سەیرت بکات ئەزانێ ئارام و ئاسودەیت. بگەڕێرەوە ماڵەوەت و ئیتر دەردەسەر بۆ خەڵك دروست مەکە).

# کاسۆلیك و جولەکە

قەشەی کاسۆلیك هەوڵی ئەدا کە ئیمانی جولەکەیەك بهێنێتە لەرزە و بیهێنێتە سەر ئایینەکەی خۆی. بەم پاڵنەرەوە بوو کە بە جولەکەکەی وت: (تاکە کارێك کە دەبێ تۆ ئەنجامی بدەیت ئەوەیە کە سێ جار بڵێیت من جولەکە بووم، ئێستا کاسۆلیکم، من جولەکە بووم، ئێستا کاسۆلیکم. من جولەکە بووم ئێستا کاسۆلیکم).

جولەکەکە ئەمەی وت، بەڵام قەشەکە پێی باش بوو کە جارێکیش لە ماڵەوەی گۆرانی ئیمانی جولەکەکە هەڵسەنگێنێت. ئەوە بوو کە چووە ماڵەوەی و جولەکەکەی بینی کە خەریکی برژاندنی مریشکە بۆ خۆی: ( تۆ نازانیت کە نابێ رۆژی هەینی کەباب بخۆیت؟)

جولەکەکە لە وەڵامدا وتی: بەڵێ دەزانم! بەڵام کاتێك کە دەمویست مریشکەکە بخەمە سەر ئاگر سێ جار وتم: من سەروەختێك مریشك بووم بەڵام ئێستا ماسیم، من سەروەختێك مریشك بووم بەڵام ....)

مامۆستا دەڵێت: (هەموو بیروباوەڕەکانی ئێمە وەهان. ئەو شتەی کە دەیڵێین لە ناخی ئێمەدا رەگی دانەکوتاوە. جۆرێك لە یاری بە وشەکان. ئەو وشانەی کە بۆ ئاراستەکردنی کارەکانمان بەکاریان دێنین).

# بۆچی درۆ

منداڵێك پاش بزربوونێکی درێژخایەن گەڕایەوە لای خێزانەکەی کە لە کەناری دەریا بوون و سەیریکرد خۆیان بۆ جێهێشتنی شوێنەکە ئامادە دەکەن.

دایك وتی: (وەرە، ئێمە دەمانەوێ بۆ نانی ئێوارە بچینە ریستۆرانت).

کوڕەکە وتی: (من برسیم نییە، حەوت دۆندرمە و سێ سۆسجم خواردووە).

دایکی بە سەرسوڕمانەوە وتی: (تۆ چۆن تووانیت حەوت دۆندرمە و سێ سۆسیج بخۆیت؟ پارەت پێبوو؟)

(من پێویستم بە پارە نەبوو. بزر ببووم و بەهۆی بزربوونەکەمەوە ئەگریام...)

ئەم منداڵە فێڵێکی گەورە فێر ببوو، ئەگەر وا دەریخستایە کە ون بووە، ئەم کارە قازانجی هەبوو بۆی و هۆکاری فێڵکردنیش هەر ئەمەیە. ئەم کارە سوودی هەیە بۆیان. ئەگەر سەرڕاست بن، زیانیان پێدەگات. بە راستی چ کەسێك دەیەوێ زیانی پێبگات و بۆچی؟ درۆ بووەتە ئامرازێك بۆ ژیان...

# پرژانە سەر هۆکارەکان

پرۆفیسۆرێك کە هاوسەرەکەی داخڵی نەخۆشخانە کردبوو، لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەو شوێنە قسەی کرد: (چۆن دەزانم کە هاوسەرەکەم چارەسەر کراوە؟) دکتۆر لە وەڵامدا وتی: (ئێمە تاقیکردنەوەیەکی سادەمان هەیە کە بۆ نەخۆشەکان بەکاری دێنین. سۆندەیەك کە ئاوی پێدا دێت دەخەینە ناو سەتڵێکەوە و دەفرێکی ئاوەکەی دەدەینێ و ئینجا داوای لێدەکەین سەتڵەکە بەتاڵ بکات). پرۆفیسۆرەکە وتی: (باشە ئەمە چی دەگەیەنێت؟) دکتۆر بە دڵنیاییەوە وتی: (زۆر روون و سادەیە پرۆفیسۆر، هەموو کەسێکی ئاقڵ یەکەم جار سۆندەکە دەبەستێت). پرۆفیسۆرەکە بە خۆشحاڵی و رەزامەندییەوە وتی: (ئەرێ زانست سەیر نییە؟ من هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە!)

لە ژیاندا، ئێمەش ئەوەندە سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئاوی ناو ژوورەکەین کە بیرمان دەچێتەوە بەلوعەی ئاوەکە بگرینەوە.

# پێکەنینی دەستکرد

مرۆڤ تراژیدیایەکی لە ژیان دروستکردووە. تەنانەت ئەو کاتەش کە پێدەکەنیت بە راستی پێناکەنیت، بەڵکو وادەردەخەیت و وادەرخستنەکەشت بەزۆرە. پێکەنینی مرۆڤ لە دڵەوە سەرچاوە ناگرێت، لە ناخی دڵەوە نییە. ئەم پێکەنینە لە ناوەرۆکی بوونەوە هەڵناقولێت، بەڵکو وەکو ئەو رەنگ و رواڵەتەیە کە رووی دەرەوە دادەپۆشێت. مرۆڤ لەبەر هۆکارگەلێك پێدەکەنێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێکەنینەوە نییە.

لە کۆمپانیایەکی بازرگانیدا، سەرۆکی دامەزراوەکە هەر خەریکی گێڕانەوەی چیرۆکی بێ مانای هەمیشەیی بوو و هەڵبەت هەموو ئەو کارمەندانەی کە لەوێ بوون پێدەکەنین، چونکە ناچار بوون! ئەوان ئیتر بە بیستنی ئەو چیرۆکانە دڵیان تێکەڵ دەهات بەڵام فایدەی چی، کابرا بەڕێوەبەر بوو. کاتێك سەرۆك نوکتە دەکات، دەبێت هاوڵاتی پێبکەنێت، ئەمە بەشێکە لە ئەرکەکان. لەم نێوەندەدا تەنیا خانمێکی تایپیست لەوێ

بوو کە پێنەدەکەنی و بەوپەڕی جددییەوە لە شوێنەکەی خۆی دانیشتبوو. سەرۆك لێی پرسی: (چی بووە؟ بۆ پێناکەنی؟)

ئەو لە وەڵامدا وتی: (من کۆتایی مانگ لێرە دەڕۆم). کەوابوو هۆکارێك نەبوو بۆئەوەی پێبکەنێت.

مرۆڤەكان بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك هۆكاری تایبەت بەخۆیانیان هەیە و لەم نێوەندەدا پێكەنینیش وەكو دانوستانی لێهاتووە رەهەندی ئابووری و سیاسی وەرگرتووە. پێكەنین چیتر بێگەرد نییە، بێگەردییەكەی نەماوە. تۆ چیتر ناتوانیت بێگەردانە و بەبێ رووكەش، وەكو منداڵێك پێبكەنیت. مرۆڤ كاتێك كە چیتر نەتوانێت بە پاكی پێبكەنێت، پاكی و بەرائەتی خودی خۆی لەدەست دەدات.

# بار

بەم دواییانە لەبارەی ژنێکەوە خوێندمەوە کە چووە لای دکتۆر تا ریخۆڵە کوێرەی لا ببات.

دکتۆر لێی پرسی: (هەراسانی کردوویت؟)

ژنەکە وتی: (نا، شتێکی وەها نییە. هەموو ژنەکانی ئەو ئەنجومەنەی کە منیش تیایدا ئەندامم، نەشتەرگەرییان کردووە. هەندێکیان ریخۆڵە کوێرەیان لابردووە و هەندێکی تریان شتی تریان لابردووە، بەڵام من هیچم لە جەستەم لانەبردووە، بۆیە شتێك نییە کە لەناو ئەنجومەندا باسی بکەم!)

مرۆڤ ئەو بارەی کە لە ئەستۆیەتی بەنرخ دەبینێت، بۆیە بە زەحمەت دەتووانرێ کەسێك بدۆزیتەوە کە شێوازی گوڵی هەبێت کە دەڵێت: (من هیچ بارێك هەڵناگرم).

تەنیا کەسێك قسەیەکی وەها دەکات کە هەموو بارەکەی بە هەبوون سپاردبێت و خاڵی سەیر لەمبارەیەوە ئەوەیە کە لە هەموو حاڵەتێکدا بارەکە لە ئەستۆی هەبوونە. ئێمە بە شێوەیەکی ناپێویست سەرەرۆیی دەکەین. دۆخی ئێمە رێك وەکو ئەو کەسەیە کە بارێك لەسەر سەریەتی و دەیەوێ سواری شەمەنەفەر بێت. رێبوارانی تر بڕوای پێ دێنن تا بارەکە لەسەر زەوی دابنێت و دەڵێن: (بۆچی ئەوەندە خۆت ئازار دەدەیت؟)

ئـەو کەسـەش وەڵام دەداتـەوە: (مـن تـەنیا بلیـتم بـۆ خـۆم بڕیـووە. بلیـتم بـۆ بارەکەم نەکڕیووە، چۆن داینێمـە سـەر زەوی؟) ئـەو پیـاوە هـەروا بـە سـادەیی و بەبێ زیادەڕەوی وتی: (بلیتم بۆ بارەکـەم نـەکڕیووە، چـۆن داینێمـە سـەر زەوی؟ کڵاونانـە لەسـەری حکومـەت. بۆیـە دەیخەمـە کۆڵم...ئـەو پیـاوە سـادەیە، پێـی وانەبوو کە هێشتنەوەی بارەکە لەسەر سـەری هـیچ جیاوازییـەك لـە تێکـڕای بـاری شەمەنەفەرەکە دروست ناکات. باری گشتی ئەم دنیایە لە گەردنی هەبوونە.

هـەموو کاروبـاری دنیـا لەلایـەن هەبوونـەوە ئـەنجام دەدرێـت. ئێمـە ڕێبـواری سـەیرین. خۆشـییەکی زۆر دەبیـنین لـەو بـارەی کـە بەدرێـژایی سـەفەر بـە شەمەنەفەری هەبوون لە کۆڵی خۆمان ناوە. تەنانـەت بـەو کەسـانەش کـە بـارێکی کەمتریان لە ئەستۆیە دەڵێین: (ژیانتان بەفیڕۆ چووە. دەبێ بـارێکی زیـاتر بخەنـە ئەسـتۆی خۆتـان). بۆچـی؟ چـونکە کاتێـك کـە مـرۆڤ دەمرێـت، ئـەو بـارەی کـە هەڵیگرتووە ئەوەندە زۆر دێتە بەر چاوان کە بێگومان سەرنج دەداتـە ئـەو شـتەی کە تێیپەڕاندووە! لەبەر ئەم هۆیەیە کە کاتێك کەسێك دەمرێت، تەنانەت لـەبارەی ئەو بارەوەش کە هەڵینـەگرتووە دەنگـۆ بـڵاو دەکەینـەوە، یارمەتیـدەر دەبـین تـا بارەکەی زیاتر بێتە بەر چاوان.

# ستایشی مردوو

پیاوێك مرد. لەو شوێنەی كە تابوتەكەیان دەخستە ناو گۆڕەوە، قەشەی گوندەكە دەستیكرد بە قسەكردن لەبارەیەوە، لەبارەی تەقوا و كارەكانی كۆچكردوو و خزمەتكردنی بەوانیتر...بە بیستنی ئەم قسانە، هاوسەری كۆچكردوو كەمێك نیگەران بوو. ڕوویكردە كوڕەكەی و پێی وت جەخت بكاتەوە لەوەی ئاخۆ تەرمی باوكی لە تابوتەكەدایە، چونكە بە درێژایی تەمەنی میردەكەی. هەرگیز ئەم هەموو كارە باشەی كە قەشەكە دەیوت لەو نەبینیبوو.

ژنەكە لە شەودا چووە لای قەشەكە و لێی پرسی: (ئەو قسە ناپەیوەندیدارانە چی بوون لەبارەی مێردەكەمەوە ئەتكردن؟ ئەوەندەی من بزانم مێردەكەم هیچ كام لەو كارانەی ئەنجام نەدابوون كە تۆ ئەتوت ئەنجامی داون). قەشەكە وتی: (گرنگ نییە. دەشێ هیچیانی ئەنجام نەدابێت، بەڵام ئەگەر خەڵكی بزانن كارێكی باشی نەكردووە چی ئەڵێن؟)

ڤۆلتێر هاوڕێیەكی هەبوو كە لە ژیاندا هەمیشە قسەی پێ دەگوت. عادەتی وابوو بەهەموو شێوەیەك ڕەخنەی لێ بگرێت و لە هەموو كارێكدا ناكۆك بێت لەگەڵی. كابرایەكی باش نەبوو. كاتێك مرد، خەڵكی چوونە لای ڤۆلتێر و وتیان لێگەڕێ با ئیتر ئاشتی لەنێوان تۆ و ئەودا بێتەكایەوە، هەرچییەك بێت ئەو هاوڕێت بوو. هەرچەندە زمانی زۆر شڕ بوو و قسەی پێت ئەوت، بەڵام ئێستاكە مردووە،

دوو وشە لە ستایشی ئەودا بنووسە. ڤۆلتێر نووسی: (پیاوێکی باش و مـەزن بـوو) بەو مانایەی کە بە راستی مردووە...

**ئەگەر کەسێك زیندوو بێت، نـاتووانین ستایشـی بکـەین. کاتێـك کـە مـرد دەبێـت ستایشی بکەین ئەو قورساییانە بخەینە گەردنی کە هەرگیز لە گەردنی نەبوون.**

# زاهیدی لوتبەرز

زاهیدێك لە دارستانێکی دوورەدەستدا بە تەنیا دەژیا. ئەو سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا. ڕێبوارێك بەلای ماڵەکەیدا ڕەت دەبوو، ئەوی بینی و وتی: ( تۆ زۆر خاکیت، هەرچەندە کەسێکی دانا و مەزنیت، هیچ شاگردێکت نییە. مامۆستای هیچ کەسێك نیت. من خەریك بوو دەچوومە دوای پیرێکی تر کە هەزاران شاگردی هەیە). پیاوە پیرۆزەکە پێکەنی و وتی: (چۆن بە منی بەراورد دەکەیت؟ من کەسێکی تەواو گۆشەگیرم و پەیوەستی کەس نیم. پەیوەندیشم نییە تاوەکو کەسێك ببێتە شاگردم. لە بنەڕەتەوە نامەوێ هیچ خۆپەرستییەك لە بوونمدا بهێنمەکایەوە، لەم ڕووەوە نامەوێ مرۆڤایەتی خۆم بۆ بوون بە ئوستاد بەهێز بکەم. بە تەواوی لە دەرەوەی خۆپەرستیدا دەبم). ڕێبوارەکە وتی: (خەڵوەت نشینێکی تریشم بینیووە کە وەکو تۆ خاکییە).

بە بیستنی ئەم قسەیە، زاهیدەکە گۆڕا و بزەیەکی تاڵی کرد. ئەو ڕکابەرێکی تری لەبەرانبەر پاکێتی خۆیدا بینی، خۆپەرستییەکەی بووە مایەی ئازاری. سەرەتا ژیر بوو، چونکە خۆپەرستییەکەی بەهۆی زاهیدێکەوە کە ڕێبوارەکە باسی کرد نەخرابووە ژێر پرسیارەوە. تاوەکو ئەو ساتەوەختانەش خۆپەرستییەکەی تێر دەبوو. بەڵام ڕستەی: (من زاهیدێکی ترم بینیووە کە وەکو تۆ نامرۆڤە.)

نارەحەتی کرد، گۆڕا. هۆشی بە بیستنی (کەسێکی تریِ وەکو تۆ هەیە) نیگەران بو

ئەو زاهیدە تەنانەت لەو ناوچە دوورەدەستەشدا خۆپەرستی خۆی گۆش دەکرد، ئەو هەستەی پەرە پێدەدا کە "من دەژیم و تاوەکو ئێستا هیچ شاگردێکم وەرنەگرتووە..."

مرۆڤێك خۆپەرستی خۆی بەو هەستە دەوڵەمەند دەکات کە: شاگردی زۆرم هەیە، لەکاتێکدا کە ئەوەیتر بەهۆی ئەوەی کە هیچ شاگردێکی نییە، گەشە بە لوتبەرزییەکەی دەدات. یەکێکیان دەڵێت: (هیچ کەسێك لە من گەورەتر نییە) و ئەویتریشیان دەڵێت: (من مرۆڤێکی سادە و نەگبەتم، رێك وەکو خاکی ژێر پێی ئێوە) مەبەستی ئەوەیە کە: (خاك لە من گەورەتر نییە! نەك ئەوەی کە خاك لە من گەورەترە. من دوایین و باشترینم). هیچ فەرق ناکات لەوەدا کە چ رێگەیەك بۆ پەرەپێدانی خۆپەرستییەکەت هەڵبژێریت. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە کارەکانی ئەقڵ دەبێ بچیتە ناو قووڵایی ناختەوە.

بۆیە حەکیم دەڵێت: (کەسێك بە تەنیا دەچێتە ناو رووناکییەوە تاوەکو لە هەردوو جۆری پەرستن خۆی رەها بکات، لە پەرستنی هەستەکان و خۆپەرستی. دەبووایە ئەو چەنێك خۆی لە خۆپەرستی شاراوە دوور دەخاتەوە ئەوەندەش خۆی لە پەرستنی سروشتی بەرچاو دوور بخاتەوە.

# ئاوێنە

پیاوێکی چینی جارێکیان چووە کۆشکی پاشای ئێران و وتی: (من لە چینەوە هاتووم و هونەرمەندێکی گەورەم. نیگاری وەها دەکێشم کە لە ژیانتدا نەتبینیووە).

پاشا وتی: ( دە کەوایە هەر لێرە وێنەیەك بکێشە. بەڵام بیرت بێت کە منیش لە کۆشکدا وێنەکێشم.هەن کە لە هیچیان لە تۆ کەمتر نییە و وێنەی سەرسوڕهێن دەکێشن).

وێنەکێشەکە وتی: (ئامادەی هەموو کێبڕکێیەکم).

باشترین وێنەکێشی کۆشکیان ئامادەکرد بۆ رکابەرێتی لەگەڵیدا. پاشا هۆشداری دایە وێنەکێشەکەی خۆی: (هەموو تواناکانت بەکاربێنە و ئەوپەڕی هەوڵی خۆت بدە. مەسەکە پەیوەندی بە ئابڕوی شاهانەوە هەیە. بیرت بێت کە نابێ لەبەرانبەر ئەم بێگانەیەدا شکست بێنیت).

شەش مانگیان مۆڵەت دایە هەموو نیگارکێشەکان. نیگارکێشە ئێرانییەکە زۆر بە شێوەیەکی سەرسەختانە کاری خۆی ئەنجامدا. بە یارمەتی دە یان بیست هاوکار دیوارەکەی بە وێنەی جوان رازاندەوە. باسی نیگارکێشییەکەی گەیشتە وڵاتانی دوور. خەڵکی دەهاتن ئیشەکانی ببینن. بەڵام موعجیزەیەکی گەورەتر لەمە روویدا. وێنەکێشە چینییەکە وتی: ئامراز و مەوادم بۆ کارەکەم ناوێت، تەنانەت رەنگیشم پێویست نییە. بەڵام پێداگری لەسەر یەك شت دەکەم و ئەویش

ئەوەیە کە تاوەکو کۆتایی کارەکەم نابێ پەردە لەسەر نیگارەکەم لا ببردرێت. هەموو بەرەبەیانێك دەچووە پشت پەردەکە و لە سەروەختی خۆرئاوابووندا لەکاتێکدا کە عەرەق لە ناوچەوانی دەهاتەخوار تەواو ماندوو دەهاتە بەرچاو. ئینجا کاتی چوونە پشت پەردە فڵچە و رەنگی لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد و ئەمەش زۆر جێگەی پرسیار بوو. هیچ جۆرە شوێنەوارێکی رەنگیش بە دەستەکانیەوە نەدەبینرا. نە پەڵەیەکی بە جلەکانیەوە بوو و هیچ قەڵەمێکیشی بەدەستەوە نەبوو. پاشا سەرگەردان بوو. لە خۆی پرسی ئەبێ ئەم پیاوە گەمژە بێت! چۆن دەکرا بەم بارودۆخەوە کێبڕکێیەك لەئارادا بێت؟ بەڵام دەبووایە شەش مانگ چاوەڕێ بێت تاوەکو کاتی خۆی دێت.

پاش شەش مانگ پاشا چوو وێنەکان ببینێت. بە بینینی وێنەکانی نیگارکێشە ئێرانییەکە زمانی لاڵ بوو. وێنەی زۆری بە درێژایی ژیانی بینیبوون، بەڵام وێنەی وەها زیرەکانەی نەبینیبوون. پاشان داوای لە وێنەکێشە چینییەکە کرد تا نیگارەکەی خۆی پیشان بدات. ئەو پەردەی لەسەر دیوارەکە لابرد. بە بینینی ئەو پاشایە زۆر سەری سوڕما. هەر ئەو وێنەیە بوو. نیگارکێشە چینییەکەش هەمان ئەو نیگارانەی کابرای ئێرانی کێشابوو، بەڵام وێنەیەکی زیادە لەسەر دیوارەکە کێشرابوو کە بینەر وا هەستی دەکرد کە لە قووڵایی حەوت هەشت مەتری دیوارەکە هاتووەتە دەرەوە! لێی پرسی: (ئەمە چ سیحرێکە؟) لە وەڵامدا وتی: (هیچ سیحرێکم نەکردووە، بەڵام لە دروستکردنی ئاوێنەدا شارەزام. بۆ ماوەی شەش مانگ دیوارەکەم تراشی و کردم بە ئاوێنە. ئەو وێنەیەی کە تیایدا دەیبینیت، هی ئەو وێنەکێشە ئێرانییەیە کە لەسەر دیواری بەرانبەرە. من تەنیا دیوارەکەم کردووە بە ئاوێنە!)

ئەو بوو بە براوەی کێبڕکێیەکە، چونکە وێنەی نیگارکێشە ئێرانییەکە بەو درەوشانەوە کەمەی کە لە ئاوێنەکەدا هەیبوو، جوانتر لە ئەسڵیەکە دیار بوو. کاتێك کە وێنەی نیگارکێشە ئێرانییەکە لە ئاوێنەدا دەردەکەوت، قووڵاییەکی زۆری پەیدا دەکرد: وێنەیەکی سێ ڕەهەندی بوو...وێنەکەی کابرای ئێرانی دوو ڕەهەندی بوو و قووڵایی نەبوو. بەڵام وێنەکەی نیگارکێشە چینییەکە سێ ڕەهەندی بوو. پاشا لە نیگارکێشە چینییەکەی پرسی: (بۆچی لە سەرەتاوە نەتوت کە ئاوێنە دروست دەکەیت؟)

نیگارکێشە چینییەکە لە وەڵامدا وتی: (لەو سەروەختەوە کە خۆمم کرد بە ئاوێنە و دنیام تیادا بینی، تەنیا بووم بە ئاوێنەساز.

بەم شێوەیەش بە لوسکردنی ئەم دیوارە بە شێوەیەکی بەردەوام، ئەم دیوارەشم کرد بە ئاوێنە و ئێستاش ئەو وێنەیەی کە تیایدا دەیبینم هەرگیز لە هەموو تەمەنمدا نەمبینیوە. ئەو ڕۆژەی کە دنیام لە خۆمدا بینی و درکم پێکرد، خۆشم وەکو ئاوێنەم لێهات و هەموو زیندەوەران و نازیندووانی دنیا لە مندا بڵاو بوونەوە).

ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتووانین خوداوەند ببینین ئەگەر دڵمان ببێتە ئاوێنە. ئەو کاتە هەموو دنیا دەچێتە ناو ناخمانەوە و هەموو دنیاش بۆمان دەبێتە ئاوێنە. دواتر دەتووانین هەموو ساتێك و لە هەموو شوێنێك تەماشای

خۆمان بکەین. بەڵام هەموو دنیا ناتووانێت ببێتە ئاوێنە، بەڵکو هەر ئێمە دەتووانین ببینە ئاوێنە. چونکە گەڕان بەدوای ڕاستیدا بە بەئاوێنەکردنی خود دەست پێدەکات.

# رازی گەوزە

بیستوومە شەوێك گەڕیدەیەك بەهۆی زۆرخواردنەوەوە، مەست و بێهۆش لە سەری کۆڵانێك کەوتبوو. نیوەشەوێکی زۆر سارد بوو. پاسەوانێکی شەو ئەوی بینی و لێی پرسی: (لێرە چی ئەکەیت؟ چیت بەسەر هاتووە؟)

گەڕیدەکە کە پێی وابوو خەریکە دەمرێت، وتی: (مردنم نزیکە، تکا دەکەم بەرەهمەنێك ئاگادار بکەرەوە). پاسەوانەکە وتی: (بۆچی بەرەهمەن ئاگادار بکەمەوە؟ ناوت چییە؟) کابرا لە وەڵامدا وتی: (گەڕیدە).

پاسەوان وتی: ( چ ئیشت بە بەرەهمەن داوە؟ من رۆحانییەکی موسڵمان دەهێنمە سەر سەرت).

گەڕیدە وتی: (نا، من دەمەوێ پێش مردنم ببمە هیندۆس). پاسەوان کە سەری لێی سوڕمابوو، لێی پرسی: (بۆچی؟ تۆ هەموو تەمەنت موسڵمان بوویت. ئێستا لە دەمی مەرگدا بڕیارتداوە دینەکەت بگۆڕیت؟) گەڕیدە لە وەڵامدا وتی: (چونکە دڵم نایەت تەنانەت یەك موسڵمانیش بمرێت! بۆیە وام پێباشترە هیندۆسێك بمرێت!)

مرۆڤ توند دەست بە کۆمەڵەوە دەگرێت، تاوەکو دوایین هەناسە و پێی باشە هیندۆسێك بمرێت نەك یەکێك لە کۆمەڵی موسڵمانان کەم بێتەوە. کۆمەڵ هەستی ئارامیت پێ دەبەخشێت، بەڵام بێ ئاگایەك ناچارە تەنیا بێت. ئەو دەبێ شارێگاکە بەجێ بهێڵێت و گومڕا ببێت.

# فێربوون لە سەگێکەوە

لە (شبلی) یان پرسی: (مامۆستای تۆ سەر بە رێبازی کێ بوو؟)

لە وەڵامدا وتی: (سەگێك! رۆژێکیان سەگێکم بینی کە لە کەناری رووبارێك وەستابوو و لە تینوێتیدا خەریك بوو دەمرد. هەر جارێك کە دەچەمایەوە تاوەکو لە ئاوی رووبارەکە بخواتەوە، وێنەی خۆی دەبینی و دەترسا! چونکە پێی وابوو کە سەگێکی تریش لەناو رووبارەکەدایە. لە کۆتاییدا پاش ماوەیەکی درێژ سەگەکە ترسی نەما و بازیدایە ناو رووبارەکەوە. لەگەڵ بازدانیدا وێنەکە لە ناو رووبارەکە نەما، بەمشێوەیە سەگەکە بۆی دەرکەوت کە ئەوەی بووەتە هۆی ترسانی، خودی خۆی بووە. لە راستیدا لەنێوان ئەم و ئەوەی کە بەدوایەوە بوو بەمشێوەیە لەناوچوو. منیش چوومە ناو خۆمەوە و بۆم دەرکەوت کە رێگری من و ئەوەی کە بەدوایەوەم خۆمم. بە فێربوون لە رەفتاری ئەم سەگەوە پەیم بە حەقیقەت برد).

لە راستیدا وێنەی ئەو سەگە لە ئاوەکەدا وێنەی دەدایەوە و ئەو خۆی دەبینی، نەك ئاژەڵێکی تر. لەبارەی تۆشەوە هەمان شت راستە. تۆ لەم دنیایەدا تەنیایت، هیچ کەسێکی تری بوونی نییە و ئەو شتەی کە رووبەرووی دەبیتەوە، تەنیا وێنەدانەوەی خۆتە. کاتێك تۆ چاوت بە کەسێك دەکەوێت پێت وایە چاوت بە کەسێکی نوێ کەوتووە؟ نەخێر، وەها نییە....

لە راستیدا وێنەی خۆت لەم کەسە نوێیەدا دەبینیت. ئایا تۆ تاوەکو ئێستا کەسێکی نوێت بینیوە؟ نەخێر تەنیا وێنەدانەوەی خۆت بینیووە.

کاتێك تۆ کەسێکی نوێ ئەبینیت، دەست دەکەیت بە حوکمدان و هەڵسەنگاندن لەبارەیەوە و بەخێرایی وێنەیەکی نوێ لەبارەیەوە لە مێشکی خۆتدا دەهێنیتەکایەوە. لەبەرانبەر ئەم کەسەدا بۆچوونی خۆت دەردەبڕیت، لەبارەی ئەم کەسەوە ئەدوێیت نەك لەبارەی خودی راستەقینەی کەسەکە. تۆ چاوت بە پیاوێك یان ژنێکی نوێ دەکەوێت و عاشقی دەبیت. ئایا هەست دەکەیت عاشقی کەسێکی تر بوویت؟! تۆ عاشقی وێنەیەك بوویت کە چاوی بە تۆ دەکەوێت و عاشقی تۆ دەبێت، وێنەیەکت خۆش دەوێت کە خۆی لە تۆ دروستکردووە. کاتێك دوو کەس عاشقی یەکتر دەبن، لانی کەم چوار کەسایەتی لەم پەیوەندییەدا بوونیان هەیە. هەڵبەت دەشێ زیاتر لە چوار کەسایەتی بوونیان هەبێت، بەلام ناشی لە چوار کەسایەتی کەمتر هەبن و بەمشێوەیە کێشەکان دەست پێدەکەن، چونکە لە راستیدا عاشقی وێنەیەك بوویت کە خۆت دروستت کردووە و کەسی بەرانبەر هیچ بەرپرسیارێتییەکی نییە تاوەکو بەو پێیە رەفتار بکات. بۆیە زوو یان درەنگ راستی ئاشکرا دەبێت و لەنێوان وێنەی دروستکراوی تۆ و کەسایەتی راستەقینەدا ناکۆکی دروست دەبێت.

هەموو پەیوەندییە خۆشەویستییەکان زوو یان درەنگ رووبەڕووی کێشە دەبنەوە، چونکە ئەو دوو کەسەی کە لە پەیوەندی خۆشەویستیدان لەناو ئەو دوو وێنەیەدا ون دەبن کە هەریەکەیان لە کەسی بەرانبەر دروستیکردووە. بیرت بێت کە ئەم وێنانە بەهیچ شێوەیەك راستەقینە نین و هەمیشە ئەوەت لەبەرچاو بێت کە ئەو کەسانەی کە دەیانبینیت، بەو وێنانەی کە لە ئەقڵی خۆتدا لێیان دروست دەکەیت، تەواو جیاوازن. هەربۆیە پاش ماوەیەك لە ژیانی هاوسەرێتی شادی و خۆشی و زیندوویی سەرەتا دەژاکێت و هەموو پەیوەندییەکە دەگۆڕێت بۆ شتێکی بێ گیان و مردوو.

# جەنگی هیندۆس و موسڵمانان

دوو پیاو دەچوونە بازاڕ. یەکێکیان بەویتریانی وت: (هیندۆس و موسڵمانەکان بەربوونە گیانی یەکتری. ئەوە هیندۆسەکان مزگەوتەکانی موسڵمانان تێکدەدەن. بۆچی ئێمەش وەکو هیندۆسێك نەچین یارمەتیان بدەین).

پیاوەکەی تر وتی: (پێناچێت ئەمە کارێکی دروست بێت. ئەم مزگەوتە هیچ زیانێکی بە ئێمە نەدەگەیاند و ئەو موسڵمانانەش لەوی خەریکی خواپەرستی بوون. ئەمە تاکە شوێنە کە موسڵمانان بۆ نزاکردن و نوێژ هەیانە و دەتەوێ ئەوێشیان لێ تێك بدەیت! نالۆژیکی و نابەجێیە). ڕۆژی دواتر، ئەو پیاوەی کە ئەویتری هان دەدا بە تەواوی سەری سوڕمابوو. کابرای یەکەم خەریکی تێکدانی مزگەوت بوو. چووە پێشەوە و لێی پرسی: (چیە؟ چی ڕوویداوە؟)

وتی: (کاتێك کە بینیم هەمووان خەریکی تێکدانن وتم لەوانەیە کارێکی ڕاست بێت).

مامۆستا دەڵێت: ئەگەر سەدان هەزار کەس بڕوای هەڵە بە ڕاست لەقەڵەم بدەن و پەیڕەوی بکەن، دیسان هەر هەڵەیە.

# قبوڵکردن

ژیان وەکو ئەوەی کە هەیە بەبێ هیچ روونکردنەوەیەکی لۆژیکی و بەڵگاندن قبوڵ بکە و بە خۆشحاڵییەوە بە تەواوی بیگرەرە خۆت.

(هاکوبین)ی مامۆستای گەورە، لە گوندێکدا دەژیا، رۆژێکیان کچی یەکێك لە بازرگانانی هەمان گوند سکپڕ بوو. باوکی فشاری زۆری بۆ هێنا تاوەکو ناوی باوکی منداڵەکە ئاشکرا بکات. لە کۆتاییدا کچەکە بەهۆی ئەو عەشقەی بۆ مەعشوقەکەی هەیبوو، ئەوی ریسوا نەکرد، لەبری ئەوە ناوی (هاکوبین)ی هێنا و وتی باوکی منداڵەکەی، ئەوە.

تا سەروەختی لەدایکبوونی منداڵەکە، باوکی کچەکە بێدەنگ بوو. بەڵام هەر کە منداڵەکە لەدایك بوو، منداڵەکەی دەست دایە و خەڵکی گوندەکەی کۆ کردەوە و چووەماڵی هاکوبین و بە قسەی ناشیرینی زۆر، عەشقبازییە سوکەکەی ئاشکرا کرد. خەڵکی پاش تێهەڵدان و کوتانێکی زۆری هاکوبین، منداڵەکەیان هەڵدایە لای و وتیان: (ئایا ئەم منداڵە ئەناسیت؟ ئەمە ئەنجامی گوناهە ئابڕوبەرەکانتە!) هاکوبین منداڵەکەی دەستدایە و گرتیە باوەشی و تەنیا وتی: (سەیرە!!!)

دوای ئەم رووداوە مامۆستا بۆ هەر کوێیەك دەچوو، ساواکەی دەپێچایەوە و لەگەڵ خۆیدا دەیبرد. ئەو تەنانەت بۆ ساتێکیش لە منداڵەکە جیا نەدەبووەوە.

لە شەوە بارانییەکان یان ڕۆژە تۆفانییەکاندا لە ماڵ دەچووە دەرەوە و لە ماڵە دراوسێکان دەرۆزەی بۆ شیر دەکرد. هەندێ لە قوتابییەکانی، پاش ئەو ریسواییە پشتیان تێی کرد.

ساڵێك تێپەڕی. دایکی مناڵەکە پاش ئەو ماوەیە تێگەیشت کە بەبێ مناڵەکەی چیتر ناتوانێ لە ژیان بەردەوام بێت. مەعشوقەکەی بەبێ ئەوەی شتێکی پێ بڵێت شاری جێهێشتبوو. کچی بازرگانەکە بە ناچاری ناوی باوکی راستەقینەی مناڵەکەی بە باوکی خۆی وت. ئەو تا راستییەکەی بیست، دەستبەجێ خەڵکەکەی کۆ کردەوە و هەموویان چوونە لای مامۆستا. ئەوان کەوتنە سەر ئەژنۆ لەبەردەمیدا. گوڵیان کردە ملی و بە کڕنوشەوە داوای لێخۆشبوونیان کرد. دواتر مناڵەکەیان، کە ئێستا ئیتر سەرزیندوو و تەندروست بوو، هەڵگرت و لە ماڵی هاکوین کردیانە دەرەوە.

لەکاتی ماڵئاواییدا هاکوین لە وەڵامی بۆچوونەکانی ئەواندا دووبارە وتی: (سەیرە ! ! !)

ئەمە یاسای (تاساتا)یە، واتە خودا هەرچییەك کە بیدات یان نەیدات، لە هەموو بارێکدا هەر باشە. هیچ شتێك خراپ نییە. چونکە هەموو شتێك خودایییە. ژیان بەو جۆرەی کە هەیە، بەبێ هیچ بەڵگاندن و ناڕەزایەتی و تکایەك، قبوڵ بکە. دواتر بۆت دەردەکەوێت کە بەبێ هیچ هۆکارێك، دڵخۆشیت.

ئەگەر خۆشحاڵیتان هۆکارێکی تایبەتی لەگەڵدایە، ئەم خۆشییە درێژخایەن نابێت. بەڵام دڵخۆشی بەبێ هۆ، شادییەکی بەردەوامە و ئەم شادییە دەرەنجامی قبوڵکردنی بێ چەند و چونی تۆیە. رووبەڕووی حەقیقەت بەرەوە و بزانە رابردوو تێپەڕیوە و بە دڵنیاییەوە هیچ هەوڵێك ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە. پەیوەستبوون پێیەوە رێگر دەبێت لە گەشەکردنتان. یادەوەرییەکانی رابردوو بدە بە زەویدا و

بەرێزەوە ماڵئاواییان لی بکە. کەسێك کە لە رابردوویدا ماوەتەوە و تیایدا دەژیت، مەترسی بەبەردبوون هەرەشەی لێدەکات. ئەقڵ بە گەڕانەوە بۆ رابردووەکان، بە گرنگ پیشانیان دەدات. ئەقڵ لەبری تەرکیزخستنەسەر ئێستا، لە ئێستا یان لە ئاییندەدا دەژیت (یان بە ئاراستەی پێشەوە یان بە ئاراستەی دواوە). رابردوو بەهۆی ئامادەیی تۆوە بوونی هەیە، ئیتر تۆ لەوێدا نیت، بۆیە چیتر بوونی نییە. ئایندەش هێشتا نەهاتووە و تۆ ناتوانیت لەپێشدا تیایدا بیت. هەنوکەش شوێنێکە کە تۆ تیایدا نیت و بەزوویی تێدەپەڕێت و دەبێتە بەشێك لە رابردوو. بۆ ئەو شتەی کە بوونی نییە مەگری. تەنانەت پەیوەست مەبن بەمرۆشەوە، چونکە ئەمرۆش دەبێتە دوێنێ. پەیوەستبوونت بە هەر شتێکەوە دەبێتەهۆی ئازار و نارەحەتیت. دواجار دەبێ تۆ هەنگاو بنێیت. کەواتە تا ئێستای تۆ لەدەست دەرنەچووە، هەموو ژیانتان چ ئەوەی خراپ بێ یان باش، چ جوان بێت یان درێو، چ دۆست بیت و چ دوژمن، هەمووی قبوڵ بکەن. لە ئێستاتان تێبگەن. بەبێ پرژانە سەر رابردووەکانت، وێڵی بکە و لەناخی دڵتەوە خۆشحاڵ بە.

# سەرانسەری ژیان پیرۆزە

رۆژێکیان عارفێك لە قوتابییەکانی پرسی: (ئایا دەتوانیت لە ژیاندا شتێك بدۆزێتەوە کە بێ نرخ بێت؟) قوتابییەکە بۆ ماوەیەك بیری کردەوە و لەو ماوەیەدا عارفەکە هەموو رۆژێك داوای وەڵامی لە قوتابییەکە دەکردەوە و دەیگوت: (چی بوو؟ هێشتا شتێکی بێ نرخت نەدۆزیووەتەوە؟) دوای مانگێك قوتابییەکە هات و وتی: (بمبوورە! من لە هەموو شوێنێك گەڕام. هەرچییەك کە بۆی دەچووم بەنرخ بوو. لەو ماوەیەدا من نەمتووانی بنووم، چونکە تۆ منت خستبووە بەردەم پرسیارێك و ناچار بووم بەدوای وەڵامەکەدا بگەڕێم. بەڵام لە کۆتاییدا نەمتووانی شتێکی بێ نرخ بدۆزمەوە).

عاریفەکە وتی: (ئێستا ئەرکێکی ترت پێ دەسپێرم. برۆ شتێکم بۆ بدۆزەرەوە کە بەنرخە. تۆ بۆ ئەوەی یەکەمیان مانگێکت بەسەر برد، ئێستا پێم بڵێ بۆ ئەمەیان چەنێك کاتت پێویستە؟ قوتابییەکە پێکەنی و وتی: (پێویستم بە تەرخانکردنی کات نییە). پاشان کەڵە پوشێکی لەسەر زەوی دەستدایە و دایە عاریفەکە و وتی: (هەر ئەمە بەسە. ئەم کەڵە پوشە یەك دنیا نرخی هەیە). عاریفەکە بە قوتابییەکە پێکەنی و وتی: (نرخی ژیان بەندە بەو دیدگایەی کە مرۆڤ لێیەوە دەڕوانێتە ژیان. من خۆشحاڵم بەو کردارەت. تۆ چەند مانگێکت بەسەر برد و نەتتووانی شتێکی بێ نرخ بدۆزیتەوە. چونکە هەموو شتێك نرخی هەیە و بۆیە

بۆ پرسیاری دووەمیان تۆ نەدەبووایە تەنانەت ساتێکیش بەفیڕۆ بدەیت. بەڵێ، کتومت وایە.

هەموو شتێك لە ژیاندا بەنرخە). چۆن دەتوانیت بڵێیت شتێکی پیرۆز لە ژیاندا بوونی نییە؟ هەموو ساتێکی ژیان پیرۆزە. بەڵام بۆ پەیبردن بەم راستییە، دەبێ چاوی پیرۆزبینت هەبێ. خودا لە بوون دوور ناکەوێتەوە، کێشەکە ئەوەیە کە بینایی تۆ بۆ بینینی ئەو ئامادە نەبووە.

# دوو جولەکە لە ماڵی راکفیلەر

دوو جولەکەی خانەنشین لە شاری نیویۆرك سەرقاڵی رێپێوان بوون کە لەپڕ خۆیان لە بەرانبەر ماڵی (نێلسن راکفێلەر) بینییەوە. یەکەمیان بە دووەمیانی وت: (ئاخ، ئەگەر پارەی ئەو کابرایەم هەبووایە لەو دەوڵەمەندتر دەبووم!)

دووەمیان وتی: (گەمژە مەبە، ئەگەر تۆ سامانی ئەوت هەبووایە هەر ئەوەندەی ئەو دەوڵەمەند دەبوویت نەك زیاتر).

یەکەمیان وتی: (تۆ هەڵەیت، ئەی بیرت چووەتەوە کە من دەتوانم هاوکات وانەی زمانی عەرەبی و عیبری بڵێمەوە؟!)

بەڵێ، خەڵك بەم شێوەیە دەژین. لەسەر عادەت.

خەڵکێکی زۆر دەوڵەمەندم بینیووە ژیانی هەژارانەیان هەبووە. پێش ئەوەی کە دەوڵەمەند ببن، عادەتەکانیان جێگیر ببوو. بۆیە دەتووانیت ئەو هەموو پیسکەییە لەناو کەسانی دەوڵەمەند دا ببینیت. ئەم پیسکەییە هی عادەتەکانی ئەو سەروەختانەیە کە هەژار بوون و تیایاندا پێکهاتووە.

# باوك و دوو منالی باش و لاسار

عیسای مەسیح چەندان جار ئەم چیرۆکەی بۆ نزیکانی خۆی گێڕاوەتەوە:

باوکێك دوو منالی کوڕی هەبوو. ڕۆژێکیان ئەم دوو برایە بڕیاریاندا لەیەکتری جیا ببنەوە. باوکیان هەموو داراییەکەی کردە دوو بەش و بە دوو براکەیدا.

برای گەورە بڕیاریدا لای باوکی بمێنێتەوە و لەگەڵیدا بژیت، بەڵام برا بچوکەکە وازی لێیهێنا و هەموو سامانەکەی بۆ قومار و خۆشگوزەرانی خەرج کرد، ئەو پاش ماوەیەك بەهۆی بێ پارەیی دەستیکرد بە دەرۆزە.

ڕۆژێکیان لەپڕ برا بچوکەکە بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات: (ئەگەر من دووبارە بگەڕێمەوە لای باوکم، بە دڵنیاییەوە ئەمبەخشێت. لەبەرئەوەی من نیوەی سەرمایە و ڕەنجی باوکم بەهەدەر داوە و هەرگیز کوڕێکی باش نەبووم بۆی. دەزانم منی خۆش دەوێت و ئەگەر بگەڕێمەوە لای ئەوا دەمبەخشێت) و بەمشێوەیە گەڕایەوە لای باوکی. پێش گەیشتنی برا بچوکەکە بۆ ماڵەوە، باوکەکە ئاگادار بووەوە کە منالەکەی دێتەوە بۆ ماڵەوە. میوانداریيەکی گەورەی ڕێکخست، قەڵەوترین مەڕیان کوشتەوە و باشترین خواردنەوەیان بۆ شەوی میوانداریيەکە هێنا. باوکەکە هەموو دۆست و ئاشنایانی بانگهێشت کرد تاوەکو بێنە ماڵی و لەم میوانداریيەدا بەشداری بکەن کە بەبۆنەی گەڕانەوەی منالە بچوکەکەی ساز کرابوو. سەروەختێك کە منالە گەورەکە لە کێڵگەوە دەگەڕایەوە ماڵەوە، خەڵکی

گوندەکـە وتیـان: (بـرا بچـوکەکەت دەگەڕێتـەوە و باوکـت لەسـەر شـەرەفی ئـەو ئێوارخوانێکی گەورە ساز دەکات.

بەڵام ئەمە زۆر نابەجێیە. تۆ ئەم سـاڵانە لای باوکـت بوویـت و خزمـەتت کـرد و بـەهیچ شـێوەیەك کـارێکی سەرپێچـیت ئـەنجام نـەداوە، بـەڵام باوکـت تائێسـتا میوانداریی لەسەر شەرەفی تۆ ساز نەداوە. برا بچوکەکەت کە ساڵانێك لە مـاڵ دوور بـووە و نیـوەی سـەرمایەی بـاوکتی لـە قومـار و خۆشـگوزەرانیدا بـەفیڕۆ داوە و هەنوکە دەرۆزەکەرێك زیاتر نییـە، ئەمشـەو دێتـەوە ماڵـەوە و باوکت ئاهـەنگێکی گەورەی بۆ رێکخستووە. بە راستی ئەمە نادادپەروەرانەیە!)

برا گەورەکە لەکاتێکدا کـە زۆر تـوڕە بـوو بەپەلـە هاتـەوە ماڵـەوە و لـە بـاوکی پرسی: (چی بووە؟ بەهۆی چی و بە شانازی کێوە ئەم میوانداربیە رێك دەخـەن؟ من کوڕێکی ملکەچ بووم بۆت و بەدرێژایی ئەو ماوەیە تۆم جێ نەهێشـتووە. بـەڵام تۆ هەرگیز ئاهەنگت بۆ من ساز نەدا. ئێستاش کە مناڵـە بچـوکەکەتان کـە نیـوەی سەرمایەی تۆ بـە فـیڕۆ داوە دەگەڕێتـە ماڵـەوە، میوانـداری بـۆ رێکدەخـەیت؟ بـە راستی جێی باوەڕ نییە! پێدەچێت تەنیا مناڵە بچوکەکەت خۆش بوێت).

باوکەکە وەڵامی دایەوە: (تۆ لە رواڵەتدا ئەو خاڵـەت بـۆ دەرنەکـەوتووە کـە بـرا بچوکەکەت لـە تـەواوی ئـەو ماوەیـەدا هەڵـە بـووە. ئێسـتاش بڕیاریـداوە دووبـارە بگەڕێتەوە لامان، بەڵام تۆ هەرگیز رێگـای هەڵـەت نەگرتووەتـە بـەر. تـۆ هەمیشـە لەگەڵ مندا بوویت. بۆیە ئاهەنگ گێڕان بۆ تۆ هیچ مانایەکی نییە).

مرۆڤ هەر ئەو مناڵـە لاسـارەیە کـە رێگـەی هەڵـەی گرتووەتەبـەر. درەختـەکان، باڵنـدەکان، بـەردەکان و ئاسمانـەکان هـەموویان هەمیشـە لای بـاوك ماونەتـەوە. ئەوان تەنانەت ماڵەوەشیان جێ نەهێشتووە چ جـای ئـەوەی کـە رێگـەی هەڵـەیان گرتبێتە بەر. مرۆڤ مناڵێکی لاسارە کە لە رێڕەوی راستەقینەی خۆی لایداوە و هەر

جارێك كە دووبارە دەگەڕێتەوە ماڵە ئەسڵیەكەی خۆی ئەوا دووبارە ئاهەنگ و هەڵپەڕكێی بۆ ساز دەدرێت. هەر كاتێك كە كەسێك لە ڕێڕەوی بنچینەیی خۆی لا بدات و ڕێگەی هەڵە بگرێتە بەر ئەوا ئەزموونی بەرفرە فێر دەبێت و بەهۆی دووربوون لە ماڵەوە، قەدری ئەو ئارامی و ئاسایشە زیاتر دەزانێت كە لە ماڵدا بەرقەرارە. لە ڕاستیدا لادان لە ڕێڕەوی ڕاست یەكێكە لە ڕێگاكانی فێربوونی ئەزموون و بەدەستهێنانی هۆشیاریی زیاتر. مرۆڤ وەكو منداڵی لاسارە و كاتێك كە منداڵێكی لاسار دەگەڕێتەوە ماڵەوە هەموو بوون– واتە باوك– لەسەر شەرەفی ئەو ئاهەنگ دەگێڕێت.

كاتێك ئەو منداڵە لاسارە دەگەڕێتەوە ماڵەوە چیتر مرۆڤی پێشوو نییە، بەڵكو پڕاوپڕ بووە لە ئەزموون و هۆشیاری. لە ڕاستیدا ئەو بەمشێوەیە گەیشتووەتە ئامانجێك كە سروشت لە ڕێگەی ئەوەوە سۆراخی كردووە. بەڵام ئەگەر ئەم منداڵە بۆ هەمیشە لەم لادانەدا بمێنێتەوە و هەرگیز نەگەڕێتە ماڵەوە، ئەوا هیچ ئاهەنگێك بە خۆشی ئەو بەرپا ناكرێت. لادەربوون دەشێ زۆر بەسوود بێت، بەو مەرجەی كە هاوشان بێت لەگەڵ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. لە ڕاستیدا ئەگەر تۆ ماڵی خۆت جێ نەهێڵیت، بەهیچ شێوەیەك درك بەو ئاسوودەیی و ئارامییە ناكەیت كە لەوێ هەیە. بە دوور كەوتنەوە لە ماڵەوە و ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ دنیای دەوروبەردا كە تێدەگەیت ماڵی تۆ چەنێك ئارام و ئاسودەبەخشە.

# گەڕیدە و ئەسکەندەر

گەڕیدەی ڕۆحی و عاریفێك بەناوی (داندامیس) لە هیندستان دەژیان، هاوڕێیانی ئەسکەندەر ئەو سەروەختەی کە ئەو چووبووە ئەو ناوچەیە پێیان وت کاتێك کە لە هیندستان دەگەڕێتەوە، ڕێبوارێك لەگەڵ خۆیدا بێنێت، چونکە کەسانی وەها دەگمەن تەنیا لە هیندستان دەدۆزرێنەوە. ئەوان وتیان: (ئێمە حەز دەکەین دیاردەی گەڕیدەیی ئەزموون بکەین و بزانین گەڕیدەیەك بە ڕاستی کێیە).

ئەسکەندەر ئەوەندە گیرۆدەی جەنگ و ململانێ بوو کە ئەم بابەتەی فەرامۆش کرد، بەڵام کاتێك کە دەگەڕایەوە، ڕێك لە سنوورەکانی هیندستان بابەتەکەی بیر کەوتەوە. ئەو خەریك بوو لە دوایین گوند ڕەت دەبوو، داوای لە سەربازەکانی کرد کە بگەڕێنەوە بۆ گوندەکە و جەخت بکەنەوە لەوەی ئاخۆ گەڕیدەیەك لەوێ هەیە.

بە ڕێکەوت داندامیس لەو گوندە و لە کەناری ڕووبار بوو. خەڵك دەیانگوت: (تۆ لەکاتی خۆیدا هاتیت. گەڕیدەی زۆر هەن، بەڵام گەڕیدەی ڕاستەقینە هەمیشە دەگمەنە و ئێستاش یەکێك لێرەیە دەتوانیت بچیت بیبینیت).

ئەسکەندەر پێکەنی و وتی: (من بۆ ئەوە نەهاتووم بچمە دیدەنی، سەربازەکانم دەچن تا بیهێنن. من دەیبەمە پایتەختەکەی خۆم).

دێهاتییەکان وتیان: (ئەم کارە ئاسان نییە...) ئەسکەندەر نەیدەتوانی باوەڕ بکات، ئەبێ گرفت چی بێت؟ ئەو کە بەسەر ئیمپراتۆرەکان و پاشاکاندا زاڵ ببوو، ئەبووایە دەرۆزەکەرێك، گەڕیدەیەك چ گرفتێك دروست بکات؟ سەربازانی ئەسکەندەر چوونە شوێن داندامیس کە بە ڕووتی لە کەناری ڕووبار وەستابوو.

پێیـان وت: (ئەسـکەندەری گـەورە بانگهێشـتی کردوویـت تـا لەگەڵیـدا بچـیتە وڵاتەکەی. هەموو ئامرازێکی ئاسودەییت بۆ دابینکراوە. تـۆ میـوانی تایبـەتی ئـەو دەبیت).

رۆحانییە رووتەکە پێکەنی و وتی: ( برۆن بـە سـەرۆکەکەتان بڵـێن کەسـێك کـە خۆی بە گەورە ناودێر بکات ناتووانێت گەورە بێت. کـەس ناتووانیـت بمباتـە هـیچ شـوێنێك. گەڕیـدە وەکـو هـەور دەجولێـت، دەرگـای سەربەسـتی کراوەیـە و مـن کۆیلەی کەس نیم).

سـەربازەکان وتیـان: (دەبـێ لـەبارەی ئەسـکەندەرەوە زۆر شـتت بیسـتبێت، کابرایەکی ترسناکە. ئەگەر پێی بڵێیت نا ئەوا گوێ ناگرێت و دەسـتبەجێ سـەرت لە لاشەت جیا دەکاتەوە).

بەڵام دەبووایە ئەسکەندەر خۆی بچێتە لای گەڕیدەکـە، چـونکە سـەربازەکانی پێیان وت: (ئەم گەڕیدەیە پیـاوێکی نـورانی و سەرووئاسـاییە و شـتی نـەزانراو لـە دەوروبەری هەیە، هەمیشە رووتـە، بـەڵام کاتێـك لـەلایت هەسـت ناکـەیت رووتـە و دواتر ئەوەت بەبیردا دێت. ئـەو ئەوەنـدە بـەهێزە کـە کاتێـك لـەلایت هـەموو دنیـا فـەرامۆش دەکـەیت. ئـەو پیـاوێکی کاریگـەرە...، کپییـەکی مـەزن دەورەی داوە. ئامادەییەکەی بەجۆرێکە وەك بڵێی هەموو پێگەی دەوروبـەر لـەژێر کاریگەریدایـە. بە راستی ئەو شایستەی ئەوەیە کە ببینرێت، بەڵام کێشەیەك هەیە، چونکە دەڵێت کەس ناتووانێت لە شوێنی خۆی بیجوڵێنێت، چونکە کۆیلەی هیچ کەسێك نییە).

ئەسـکەندەر لەبارێکـدا کـە شمشـێری بەدەسـتەوە بـوو بـەرەو لای دانـدامیس رۆیشت. ئەو بە بینینی ئەسکەندەر پێکـەنی و وتـی: (شمشـێرەکەت داپۆشـە کـە لێرە کەڵکی نییە. تۆ تەنیا دەتووانی جەستەم بکەیتە دوولەت لەکاتێکدا کە بوونی من ماوەیەکی درێژە لێرە رۆیشتووە. شمشێری تۆ ناتووانێت زەبـر لـە بـوونی مـن بدات، بۆیە بەلایەوە بنێ، منداڵ مەبە).

ئەڵێن ئەمە یەکەمجار بووە کە ئەسکەندەر بچێتە ژێر فەرمانی کەسێکەوە، تەنیا بەهۆی بوونی بەهێزی ئەو پیاوە، نەیدەتوانیّ بزانیّ کێیە. بۆیە شمشێرەکەی داپۆشی. ئەو دواتر بە یاوەرانی وت: (من هەرگیز ڕێکەوتی پیاوێکی وەها کاریگەرم نەکردووە). کاتێك کە گەڕایەوە ئۆردوگاکەی خۆی وتی: (قورسە کەسێك بکوژی کە ئامادەی مردنە، کوشتنی کەسێکی وەها بێسوودە. تۆ دەتووانیت کەسێك بکوژیت کە شەڕت لەگەڵ دەکات. ئەو کاتە کوشتنی ئەو مانایەکی هەیە نەك کەسێك کە ئامادەی مردنە و دەڵێت هانیّ سەرم لێبکەوە). بە ڕاستیش داندامیس وتبووی: (ئەمە سەری منە، دەتووانی لێی بکەیتەوە. کاتێك سەرم لێکرایەوە، ئەبینی کە ئەکەوێتە سەر زەوی و منیش کەوتنەکەی ئەبینم. چونکە بوونم لە جەستەم جودایە. من هێزی بەدیکردنم هەیە).

دواتر ئەسکەندەر بە هاوڕێکانی وت: (گەڕیدەی زۆر هەبوون کە دەمتووانی بیانهێنم، بەڵام هیچ کامیان ڕاستەقینە نەبوون. من ڕێکەوتی پیاوێکم کرد کە بە ڕاستی دانسقە بوو و ئێوە بە ڕاست لەبارەیەوە بیستبووتان. ئەو کەسێکی دەگمەن بوو، بەڵام کەس نەیدەتووانی ناچاری کارێکی بکات، چونکە لە مەرگ نەدەترسا. کاتێك کەسێك لە مردن ناترسێت، چۆن دەتووانیت شتێك بەسەردا بسەپێنیت؟)

ئەوە ترسی تۆیە کە دەتکاتە کۆیلە. کاتێك لە شتێك و کەسێك نەترسیت، چیتر کۆیلە نابیت، لە ڕاستیدا ئەوە ترسە کە ناچارت دەکات پێش ئەوەی ئەوانیتر هەوڵ بدەن بتکەنە کۆیلەیەك، بیانکەیتە کۆیلە.

کەسێك کە ئازا بێت، لە هیچ کەسێك ناترسێت و هیچ کەسێکیش لێی ناترسێت. ترس بە تەواوی لەناو دەچێت.

# جوتیار و پارێزەر

پـاك بــە. تــەنیا لــەو بارەدایــە کــە ئەگــەری وەرچــەرخان بدۆزیتــەوە. تــۆ سەرسەختانە هەوڵتداوە زیرەك بیـت و فێڵبـاز بیـت، بـەڵام هـەموو ئـەو زیرەکـی و فێڵبازییە گەمژانەیە. مرۆڤ کە بـە راسـتی هۆشمەنـد بێـت پێویسـتی بـە زیرەکـی و فێڵبازی نییـە. مـرۆڤ کـە بـە راسـتی هۆشمەنـد بێـت پاکـە. هۆشمەنـدی، کـرداری پاکبوونە.

پارێزەرێـك گـەنج هـەبوو کـە کارەکـەی لـە کۆمپانیایـەکی سـکەی شـەمەنەفەر دەسـتپێکرد. رۆژێکیـان جوتیارێـك بـۆی دەرکـەوت مانگاکـەی کـە لـە پێشـبڕکێی شیردان بردوویەتەوە، لە کێڵگەیەکدا بزر بووە کە سکەی شەمەنەفەری پیـادا رەت دەبێت. جوتیارەکە لەکاتی خۆیدا چووە دادگا و لـە سـکاڵایەکدا داوای قـەرەبووی لە کۆمپانیاکە کرد. کاتێك نۆرە هاتـە سـەر ئـەم کەیسـە، پـارێزەرە گەنجەکـە لـە شارەوە هات تاوەکو لە دادگایی گوندەکەدا کە لـە کۆگـای فرۆشـگایەکی گـەورەدا بەرپا کرابوو، داکۆکی لە کۆمپانیاکە بکـات. یەکـەمین کـار کـە پارێزەرەکـە کـردی ئەوە بوو کە جوتیارەکەی بـردە لایەکـەوە تـاوەکو قسـە و ئاشـتی لەگـەڵ بکـات. پارێزەرە گەنجەکە ئەوەندە قسـەی کـرد کـە جوتیارەکـە دواجـار بـە نابەدڵییـەوە نیـوەی قــەرەبووە داواکراوەکــەی قبــوڵ کــرد و واژۆی کــرد. دوای ئــەوەی کــە جوتیارەکە رێککەوتنەکـەی واژۆ کـرد و چـەکەکەی وەرگـرت، پـارێزەرە گەنجەکـە نەیتووانی بەسەر ئەم سەرکەوتنە سادەیەدا تێپەڕێت. روویکردە جوتیارە پیرەکـە

و وتی: (ئەزانیت، من حەز ناکەم بیلێم، بەڵام ئەمڕۆ مەرجم لەگەڵ خۆمدا کردبوو کە ناتووانم لە دادگادا بیبەمەوە. کاتێك ئەو بەیانیی ئەو رۆژە شەمەنەفەر بە کێڵگەکەی تۆدا رەت دەبوو، ئەندازیاری شەمەنەفەرەکە خەوتبوو و شۆفێرەکەش لە ژووری خزمەتگوزاریدا ئیشی هەبوو. من تەنانەت یەك شایەتیشم نەبوو). جوتیارە پیرەکە بزەیەکی کرد و لە کاتێکدا کە لە جوینی توتن بەردەوام بوو، وتی: (باشە کەوایە با منیش پێت بڵێم گەنجۆ! منیش لە بردنەوەی کەیسەکەم گومانم هەبوو. ئەو مانگا حەپۆلە سەر لەبەیانی ئەمڕۆ گەڕابووەماڵەوە!)

# کێ تۆی دروستکردووە؟

قەشـەی نـوێ دەچـووە مەراسـیمی ناسـاندن و دایکەکـە بـە (ئێمـا)ی کچـە بچوکەکەی وت: (ئەگەر ناوتی پرسی بڵێ ئێما جین، ئەگەر وتـی تەمـەنت چـەندە بڵێ هەشت ساڵ، ئەگەر پرسی کێ دروستیکردوویت بڵێ خوا دروستی کردووم).

قەشـەکە لـەکاتی خۆیـدا گەیشـت. ئینجیـل و کڵاوەکـەی بـەلاوەنا و بـەرەو لای ئێمای بچکۆلە چوو. دەستی بەسەریدا هێنا و لێی پرسی: (کیژۆڵە ناوت چییە؟)

(ئێما جین)

(باشە، ئێما جین تەمەنت چەندە؟)

(هەشت ساڵ)

(ئۆی، زۆر باشە! ئێما جین ئەزانیت کێ تۆی دروستکردووە؟)

کیژۆڵەکـە چـەند سـاتێك وەسـتا و پاشـان لـە وەڵامـدا وتـی: (دایکـم نـاوی ئـەو کەسەی پێ وتم بەڵام بیرم چووەتەوە!)

بە بەقـەرزوەرگرتن لـەوانیتر و فێربـوون لـە نەریتەکانـەوە، مەعریفـەی تـۆ هـیچ کاتێك نابێتە (مەعریفەی تۆ). تەنیا زیاتر و زیاتر دەبێتە مایەی گاڵتەجاڕیت. ئـەم ڕێگای ڕۆشنگەرەکان نییە.

# کەمێك ئارام بگرە، کازیوە نزیکە

گەڕیدەیەکی ڕۆحانی لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر لە سەفەردا بوو. ئەو و یاوەرەکانی ڕێگایان بزر کرد، بۆیە لە چەند ڕێبوارێکیان پرسی ئاخۆ گوندی دواتر چەنێك دوورە. ڕێبوارەکان وتیان: (تەنیا دوو فرسەنگ).

گەڕیدە و یاوەرەکانی دوورابیەکی زیاتر لە دوو فرسەنگیان بڕی، بەڵام هیچ گوندێکیان لەو نزیکانە بەدی نەکرد. بۆ دووەم جار ڕێکەوتی چەند ڕێبوارێکیان کرد و دیسان هەمان پرسیاریان دووبارە کردەوە و هەمان وەڵامی پێشوویان دەستکەوت: (تەنیا دوو فرسەنگ). ئەوان دوو فرسەنگی تریان بڕی، بەڵام دیسان هیچ گوندێکیان بەدی نەکرد. تەنانەت هیچ نیشانەیەکیش لەوەی کە دێهاتێك لەو نزیکانەیە بەدی نەکرا.

ئاناندا کە یەکێك بوو لە یاوەرانی ئەو گەڕیدەیە و زۆر نارەحەت و نائومێد ببوو، وتی: (بۆ دەبێ ئەو ڕێبوارانە درۆمان لەگەڵدا بکەن؟ ئێمە چوار فرسەنگمان بڕیوە بەڵام نەگەیشتووینەتە هیچ گوندێك. ئایا ئەوان فریویان داوین؟) مامۆستاکە لەبارێکدا کە پێدەکەنی، وەڵامی دایەوە: (تۆ درك بەو خاڵە ناکەیت، ئەوان ڕێك وەکو منن، لە ڕاستیدا بەهۆی چاکەی خۆیان و ئەو خۆشەویستییەی کە هەیانبوو بۆمان دوو جار دووبارەیان کردەوە کە تەنیا دوو فرسەنگمان ماوە تا بگەینە مەنزڵ. ئەوان بەو کارەیان ئازایەتییان پێ بەخشین تاوەکو بە ئومێدەوە

پاشماوەی ڕێگاکە تەواو بکەین. ئەگەر سەرەتا پێیان بوتینایە کە سەد فرسەنگمان ماوە تا ئەگەین، ئەوا ئومێدمان

لەدەست دەدا و لەوانەبوو هەر لەوێ بوەستین و چیتر لە ڕێگاکەمان بەردەوام نەبین.

مامۆستایەکیش هەر کارێکی وەها دەکات. ئەو ناتووانێت لەبری ئێوە بە قۆناغەکانی پشێویی دەروونیدا ڕەت ببێت، بەڵام دەتووانێ یارمەتیتان بدات و ئازایەتیی پێویستتان بداتێ بۆ ڕەتبوون لەم قۆناغانە. ئەو پێتان دەڵێت: (بەردەوام بن. هیچی وەهای بۆ کۆتایی شەو نەماوە، ڕووناکایی بەیان نزیکە). بەمشێوەیە تۆ هان دەدرێیت و ئەو ئازایەتییەش بەدەست دێنیت کە بۆ ڕەتبوون لە قۆناغە سەخت و تاقەتپڕوکێنەکان پێویستە.

بەبێ یارمەتی و هاوکاریی مامۆستایەکی ڕاستەقینە، هەنگاونان بەم ڕێگایەدا مەحاڵە، بەپێچەوانەوە کێ ئازایەتیی پێویستتان ئەداتێ؟ لەگەڵ چوونەناو دنیای ناوەوە، ڕووبەڕووی پشێوی و سەرلێشێواوی دەبیتەوە. هەزار و یەك کێشە و نەخۆشی کە لە بوونی تۆدا پەنگیان خواردووەتەوە، دێنەوە سەرەوە. هەموو ئەو کێشە و نەگبەتییانەی کە لە ژیانتاندا بوونی هەبووە لە دنیای ناوەوەدا چاوەڕێتانە. سەفەر بۆ دنیای ناوەوە، واتە هەنگاونان بەرەو دۆزەخ، بەڵام هیچ کەسێك پێی ناگات مەگەر ئەوەی کە بە دۆزەخدا ڕەت ببێت. لە ڕاستیدا دۆزەخ دەروازەی چوونەناو بەهەشتە، یان بە دەربڕینێکی تر، بەهەشت کۆتایی ئەو ڕێگایەیە کە سەرەتاکەی دۆزەخە. دەبێ بۆ گەیشتن بە بەرەبەیان و سپێدە، بەرگەی شەو و تاریکیی پێویست بگریت.

# نەخشە

پیاوێك لە جادەیەکی چۆڵ ئۆتۆمبێلی لێدەخوڕی. بۆ ساتێك گومانی ئەوەی کرد کە ڕێگاکەی هەڵەیە. دەرۆزەکەرێکی لە کەناری جادەکە بینی. وەستا و لێی پرسی: (ئەریٚ ئەم ڕێگایە بەرەو شار دەڕوات؟)

دەرۆزەکەر: (نازانم) پیاوەکە لێی پرسی: (ئەریٚ ئەم ڕێگایە بەرەو شاخەکان دەچێت؟) دەرۆزەکەرەکە وتی: (نازانم)

پیاوەکە کە لە وەڵامەکانی دەرۆزەکەرەکە بێتاقەت ببوو، بە تووڕەییەوە وتی: (کەواتە تۆ هیچ نازانیت). دەرۆزەکەرەکە پێکەنی و وتی: (بەڵام من بزر نەبووم).

کاتێك ون بوویت، نەخشەی پێویستت پێیە، زانیاریی پێویستت لایە، کتێبی پێویستت لایە. بەڵام کاتێك گەیشتوویتە مەنزڵ کوا پێویستت بە باریٚ قورس و ناپێویستە؟ خەڵکانی بینا بۆ هەر هەنگاوێك کە دەینێن لە مەنزڵن. خەڵکانی بینا، مەنزڵی خۆیان لە کۆڵی خۆیان دەنێن. خەڵکانی بینا دەزانن کە مەنزڵی خۆیانن. کەسێك کە خۆی مەنزڵ بێت، هەمیشە گەیشتووە. کەسێکی وەها قەت بزر نابێت. دەرۆزەکەرەکە بزر نەبووە، بۆچی؟ چونکە ئەو ناچێتە شار. ئەو ناچێتە شاخەکان. ئەو ناچێتە هیچ کوێیەك. ئەو لە مەنزڵە. ئەو لە هەر کوێیەك بێت مەنزڵ لەوێیە.

نەخشەکان کاتێك بەکاردەهێنرێن کە مەنزڵ، لە دەرەوەی تۆدا بێت. دەشێت نەخشەکان تۆ کە مەنزڵی خۆتیت، لە خۆت دوور بخەنەوە.

بـوونی خـۆت بخوێنـەرەوە، چـونکە کتێبێـك دەسـت ناکـەوێ کـە تـۆی تیـادا نوسرابێت. کتێبەکە تۆیت، جیهانی مەزن تۆیت، تۆ تەنیا لە ناو خۆتدا نوسراویت، دەبێ ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە و بەو نەخشانە بکەویتە ڕێ و مەنزڵ بدۆزیتەوە...

# ئێمە بزر بووین

پیاوێك خەریکی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکەی بوو و ژنەکەشی سەیری نەخشەکەی دەکرد. لەپڕ ژنەکە قیژاندی و وتی: (ئێمە ون بووین، چونکە ئەم نەخشەیە سەرەو ژێر چاپ کراوە !) نەخشەکان خۆبەخۆ سەرەوژێر چاپ ناکرێن. مرۆڤەکان نەخشە سەرەوژێر دەگرن. ئەو ژنە نەخشەکەی سەرەوژێر بەدەستەوە گرتبوو.

بوك ناتووانێ سەما بکات ئەڵێت ژوورەکە خوارە. ئەگەر تۆ سەرەوبن و ئاوەژوو وەستابیت، هەموو ئەو نەخشە و کتێبانەی کە دەیانخوێنیتەوە سەرەوبن دەردەکەون. دەبێ بە دروستی نەخشە و کتێبەکان بەدەستەوە بگریت. ئەگەر تۆ کەسێکی شڵەژاو و تووڕە بیت، ئەو تووڕەییە لەو کتێبەدا ڕەنگ دەداتەوە کە دەیخوێنیتەوە. ئەو کاتە هەڵێنجان و لێکدانەوە و خوێندنەوەت لەو کتێبە لەگەڵ تووڕەیی و توندوتیژیدا ئاوێتە دەبێت. کەواتە بنچینەکە تۆیت، ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە لاوەکییە، ئەگەرچی دەشێ لە ڕواڵەتدا ئاوەژوو دیار بێت.

ئەو کەسانەی کە کتێبی خۆشەویستی دەخوێننەوە و لێکدانەوەیەکی ڕەق و زبری لێ دەخەنەڕوو، تەنیا خۆیان دەناسێنن نەك کتێبەکە. ئەوان بە دەنگێکی بەرز دەڵێن: (ئێمە کەسانی تووڕە و ڕەقین، سەیرمان بکەن!) ئەگەر تۆ کەسێکی شێت و دەبەنگ بیت، لێکدانەوەت لە تێکستە دینییەکانیش شێتانە و دەبەنگانە دەبێت. ئەگەر بترسیت، ئەوا پێ بخەیتە هەر شوێنێك ڕووبەڕووی ترس دەبیتەوە.

تەنانەت ئەگەرچی هەزار بەڵگەی لۆژیکی بۆ لێکدانەوەکەت بهێنیتەوە ئەوا دیسان لێکدانەوەکەت ئاماژەیە بە ناوەوەت. خەتای تۆیە نەک تێکستەکان...تۆ خوار وەستاویت، تۆ راست و رێک نیت. کاتێك وەکو مەیمون لاپەڕە هەڵدەدەیتەوە، ئەو کاتە هەموو شتێك وەکو مەیمون لێکدەدەیتەوە. وەکو "کانت" دەڵێت کەسێك کە رۆحێکی درێو و شپرزەی هەیە، لێکدانەوەشی بۆ کتێبی پیرۆز شپرزە و چڵکن دەبێت ئەگەرچی هەزار و یەك بەڵگەی درێو و شپرزەی لۆژیکی بۆ لێکدانەوەکەی خۆی بهێنێتەوە.

# رێبوار

رێبوارێـك پرسـیاری ناونیشـانی فەرمانگـەی پۆسـتەی لـە کابرایـەك کـرد کـە دانیشتوویەکی کۆنی شارێك بوو. ئەو لە وەڵامدا وتی: (باشە! یەکەم جار دەچیتە پشت ئەو دوو بینایەیە، پاشان بەلای راستدا پێچ دەکەیتەوە...نا، دەچیتە پشت ئەو دوو بینایەیە و پاشان بە لای چەپدا پێچ دەکەیتەوە....نا، وا نییە، ئاخر یەك بینایە لەم شەقامەدا هەیە. دەچیتە پشتیەوە، بەلای چەپدا پێچ دەکەیتەوە و پاشـان دەچیتە پێشـەوە.....نا! راسـتییەکەی پـێم وانییـە تـۆ بتـوانی لێـرە فەرمانگەی پۆستە بدۆزیتەوە!) خەڵکی لە سەرگەردانیی وەهادا دەژین. هەڵبەت ئەمە تەنیا لەو کاتانەدا نییە کە شتێکی خواردووەتەوە و مەستە. خەڵکی لە هەموو ساتێکدا خەریکی خواردنەوەی هەزاران جۆر کحولن. هەندێکیان شێتی پارەن، لەم بارەدا پارە کحولی ئەو کەسانەیە. هەندێکیان شێتی دەسەڵاتن، لەم بارەدا ئەوان لە شەرابی دەسەڵات مەست دەبن و لە ئەنجامدا مەیخۆرن. شێتەکانیش جۆری جیاوازیان هەیە. بەڵام هەموو کەسێك کحولی تایبەتی هەیە کە مەستی دەکات. ئایا تاوەکو ئێستا روانیووتە چاوی بێچارەیەك کە سەیری پارەکەی دەکات؟ ئەو وەها دەڕوانێتە پارەکەی وەك بڵێی قەد و باڵای مەعشوقەکەیەتی. ئەو بە جۆش و تامەزرۆییەوە دەست لە پارەکەی ئەدات. ئەو بە عەشق و خۆشییەکی وەهاوە سەرمایەکەی کەڵەکە دەکات وەك بڵێی بەهیچ

شێوەیەك لەم دنیایەدا نییە! هەموو دنیای بیر دەچێتەوە....سیاسەتمەدارێکی گەندەڵ و شێتی دەسەڵات ببینە. ئەو مەستە. ئەو پێویستی بەوە نییە کە ئاڵودەی خواردنەوەیەکی کحولیی تر ببێت. پێویستی بە هیچ دەرمانێکی تر نییە. پێشتر ئاڵودەی دەسەڵات بووە. لەوانەیە تەنانەت دوژمنی کحول و دەرمانیش بێت و بۆ قەدەغەکردنی خواردنەوەی کحولی لە وڵاتەکەیدا هەموو هەوڵێك بخاتە گەڕ، بەڵام خۆی مەستە. بە دڵنیاییشەوە ئەو کحولەی کە لەو دەسەڵاتە بەرهەم هاتووە لە هەموو کحولێك کە لە ترێ بەدەست دێت مەترسیدارترە. بە راستی ئەم شێتانەی دەسەڵات مرۆڤی مەترسیدارن. بە کورتی هەموویان سەرخۆشن. ئەگەر خواردنەوەی جۆراوجۆر بەکاردێنن، بەڵام هەرچۆنێك بێت مەستن.

**گەر فەرمان دەرچێ کە مەست بگرن**

**لە شاردا ئەوەی کە هەیە، دەگرن**

# خەڵوەتنشینی و ریا

پیرەژنێك سی ساڵ بوو خزمەتی مامۆستای دەكرد، ئەویش هەم مورید و هەم دایكی ئەو مامۆستا خەڵوەتنشینە بوو. سەرەنجام ڕۆژی مردنی پیرەژن هات. لە سەرەمەرگدا بانگی ژنێكی خراپەكاری كرد و پێی وت: (بڕۆرە لای مامۆستاكەم. ئەو راهیبێكە كە لە داوێنی ئەو شاخە كوڵێتێكی هەیە. بچۆرە ناو كوڵیتەكەی و كەمێك عیشوە و ناز بنوێنە. دەمەوێ پێش مردنم تاقی بكەمەوە. من ئەمشەو دەمرم. حەز دەكەم دڵنیابم ئاخۆ لە خزمەتی مرۆڤێكی پاك و بێگەرد دابووم). ئەو ژنە ترسا و وتی: (یەعنی ئەو ئەوەندە خۆپارێزە؟ من تاوەكو ئێستا ڕووبەڕووی راهیبەكان نەبوومەتەوە. ئەمە ناكەم).

بەڵێ، ژنێكیش كە ئەو تایبەتمەندییانەی هەبوو بوێریی ئەوەی نەبوو پیاوێكی وەها فریو بدات. پیرەژنەكە ئەوەندەی گوت تا دواجار ژنەكەی رازیكرد.

ژنەكە چووە كوڵێتی مامۆستا و دەرگاكەی كردەوە. مامۆستا خەریكی تێڕامان بوو. نیوەشەو تێپەڕیبوو و لەو دەوروبەرە جگە لە كوڵیتەكە هیچ شتێك بەدی نەدەكرا. ژنەكە هاتە ناوەوە. مامۆستاكە سەیرێكی كرد و پاشان لە شوێنی خۆی هەڵسا و وتی: (بۆچی هاتوویتە ئێرە؟ زووكە لێرە بڕۆ). هەموو جەستەی راهیبەكە كەوتبووە لەرز...

ژنەکە نزیکتر کەوتەوە. مامۆستاکە لە کۆڵیتەکە چووە دەرەوە و هاواریکرد: (خەڵکینە! ئەم ژنە دەیەوێ فریوم بدات)..

ژنەکە بە ناچاری گەڕایەوە لای پیرەژن و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. پیرەژن چەند خزمەتکارێکی نارد تاوەکو ئاگر بەر بدەنە کۆڵیتی مامۆستاکە. پاشان بە ژنەکەی وت: (ئەم پیاوە تەمەنی بەفیڕۆ داوە. ئەو هێشتا پاک نەبووەتەوە. ئەو وەکو منالان نییە. لەوانەیە بوبێتە خەڵوەتنشین، بەڵام نەبووەتە مرۆڤ. ئەو شەهوەتەکانی لە پشت خەڵوەتگەراییەکەیەوە شاردووەتەوە. چۆن دەبێ ئەو وا خێرا تێبگات تۆ چ کارەیت و ژنێکی ئاسایی نیت؟ چۆن دەبێ گومانی ئەوە بکات کە تۆ بۆ لەخشتەبردنی چوویتەتە ئەوێ؟ بۆچی دەبێ بترسێت و رابکات؟ ئەو دەیتووانی وەکو مرۆڤێکی تێگەیشتوو و پاک رەفتار بکات. بۆ نموونە بڵێت فەرموو دانیشە. ئیشت هەیە. دەبووایە ئەو لانی کەم تۆزقاڵێک سۆزی هەبێ. ترسەکەی ئاماژەیە بە زۆری شەهوەتی. ئەو پێش سی ساڵ پێی وتم باکی بە ئارەزووەکانی جەستە نییە و لێیان رەت بووە. ئەگەر وایە ئەی بۆچی ترسا؟ پێم وایە بەدرێژایی ئەو ماوەیە خەریکی نواندن بووە. تەقواکەی لە ناخەوە سەرچاوەی نەگرتووە. بەڵکو تەنیا گەمەیەکی رووکەشانە بووە. ئەو لەو ماوەیەدا گۆڕانکاریی زۆری لە رواڵەتی خۆیدا ئەنجامداوە و نواندنی زۆر فێر بووە، بەڵام ناخی هەروەکو خۆی ماوەتەوە. ئەو لە بەدەستهێنانی پاکێتی منالان دەستەوستان بووە. مخابن لەو تەمەنەی کە لە پای ئەو گەمژەیەدا بەسەرم برد. سەد مەخابن!) پیرەژن دوای ئەو قسانە گیانی سپارد.

ئەگەر خەڵوەتگەرایی و راهێنانەکانت ناخت لە خەوشەکان پاک نەکەنەوە، پوشێک ناهێنن.

رۆحانییەک دەڵێت: (ئێمە تەنیا یەک موعجیزەمان هەیە، ئەویش منالێتییە).

کاتێك منداڵ برسیەتی، دەگریت و خواردنی دەوێ. کاتێك منداڵ خەوی دێت دەخەوێت. ئێمە بە هەڵە لە هەوڵی ئەوەداین کە کردار و کاردانەوە سروشتییەکان منداڵان ڕێکبخەین. بەمشێوەیە سروشتیبوونیان لێ بسەنین و دەمامکیان لە شوێن دابنێین. زۆربەی کات ڕێکارەکانی پەروەردە، خستنەڕووی شێوازێکن بۆ سەرکوتکردنی سروشتی منداڵان، نەك ڕێگایەك کە سەردەکێشێت بۆ گەشەکردنیان. ئێمە منداڵان فێر دەکەین چۆن فریومان بدەن. بەڵام هیچ کاتێك هەوڵ نادەین متمانە بە سروشتی منداڵان بکەین. ئێمە بەم کارەمان منداڵێتی و پاکێتی لەناو دەبەین. ئێمە وا لە منداڵانمان دەکەین وەکو گەورەکان ڕەفتار بکەن. وەك بڵێی ڕەفتاری گەورەکان نایابە. مردووشۆر ڕەفتاری قورسی گەورەکان ببات! کاتێك منداڵ فێر دەبێت کە چۆن خودی ساختەی بهێنێتە ناو پانتایی ژیانەوە و خودی ڕاستەقینەی سەرکوت بکات، ئەو کاتە هەموو ژیانی دەبێتە ساختە. ژیانی ساختە، ژیانی ساختەیە.

ژیانی ڕاستەقینەش لە بنەڕەتدا ژیان نییە، ئێمە منداڵان ناچار دەکەین بێ ئەوەی خەویان بێت بچن بخەون. خەو مەسەلەیەکی دەروونییە. ئەگەر خەو بەسەر دەروونداڕ زاڵ بێت ئەوا منداڵ خۆبەخۆ خەوی پیا دەکەوێت. هیچ ناچارییەك نییە.

خواردنی منداڵانیش بووەتە ناچاری!

ئەو باوك و دایکەی منداڵان ناچاری خواردن دەکەن، وەك بڵێی مەڕ بۆ قەسابخانە بەخێو دەکەن. پێویست بەو هەموو زۆرداری و ناچارکردنە ناکات. جەستە خۆی کارەکان بەڕێوە دەبات. ئەگەر جەستەی منداڵ پێویستی بە خۆراك بێت، بێ ئەوەی کە پێویستی بە داواکاری و ناچاری بێت دەچێتە لای خواردنەکە

و بایی پێویست دەخوات. کەمێك واز لە منداڵەکان بهێنن. لە ژیان و منداڵییان بێبەرییان مەکەن.

هەوڵ مەدەن ئامێری بێ هەستی دکتۆر و ئەندازیاریان لێ دروست بکەن....

# عەشق و دەمارگیری

هەموو کەسێك دەمارگیریی خۆی هەیە. مەسیحی، هیندۆس، جولەکە و ...هەموویان دەمارگیریی خۆیانیان هەیە. ئەم دەمارگیرییانە ڕەگی قووڵیان هەیە. دەتووانیت لەبارەی عەشق بدوێیت، بەڵام ئەمە هەمیشە ڕووکەشە.

گەنجێکی دەسکورت و پەرێشان خۆی دەگەیەنێتە نهۆمی چلی هۆتێلێك لە ناوەندی شاردا و لە بالکۆنی ژوورەکەوە هەڕەشەی ئەوەیکرد کە خۆی هەڵدەداتە خوارەوە. نزیکترین شوێن کە دەکرا لێیەوە دەستت پێی بگات، سەربانی بینایەکەی تەنیشت بوو کە چەند مەترێك لە نهۆمی چلەمی هۆتێلەکە نزمتر بوو. پۆلیس چەنێك هەوڵیدا نەیتووانی بیهێنێتە خوارەوە. دواجار بڕیاریدا قەشەیەك ئاگادار بکاتەوە. قەشەکە بە خێرایی گەیشتە جێ و بە میهرەبانییەکی زۆرەوە بە گەنجە شپرزەکەی وت: (بیر بکەرەوە کوڕەکەم...بیر لە باوك و دایکت بکەرەوە کە عاشقی تۆن).

گەنجەکە وتی: (ئاخ! ئەوان منیان خۆش ناوێت. خۆم هەڵدەدەمە خوارەوە!)

قەشەکە کەمێك دەنگی بەرز کردەوە: (بیر بکەرەوە کوڕەکەم. بیر لەو ژنە بکەرەوە کە خۆشت دەوێت).

گەنجەکە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: (هیچ کەسێك عاشقی من نییە. خۆم هەڵدەدەم).

قەشـەكە پاڕایـەوە: (بـەڵام كوڕەكـەم بـیر بكـەرەوە. بـیر لـە مەسـیح و مریـەم بكەرەوە كە خۆشیان دەوێیت).

گەنجەكە بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری كرد: (مەسیح و مریەم! ئەمانە كێن؟)

لێرەدا قەشەكە بە توڕەییەوە هاواریكرد: (خۆت هەڵدە خوارەوە هەی بێ دیـنی حەرامزادە، خۆت هەڵدە خوارەوە).

لەناكاو هەموو عەشق لەناو دەچێت. هەموو قسەكان لەبارەی خۆشەویستییەوە رووكەشـن. هـەموو وشـەكان لـەبارەی یـەكتری قبـوڵكردن لـە قووڵاییـدا تـەنیا بەرگەنەگرتنـە لەبەرانبـەر ئـەوانیتردا. خـەڵكی دەڵـێن: (بەرگـەی یـەكتری بگـرن). مەبەستت چییە كە ئـەم قسـەیە ئەكـەیت؟ تەنانـەت خـودی وشـەی (بەرگـەگرتن) دزێوە. ئایا كاتێك بەرگەی كەسێك دەگریت خۆشت دەوێت؟

# منخوازی و ترس

سەروەختێك كە لە ماڵی هونەرمەنداندا نیشتەجێ بووم، بەرپرسی ئەو شوێنە خەڵكێكی زۆری بانگهێشت كردبوو تا بێن و بمبینن. هونەرمەندێكی ژن لەوێ بوو كە سەعاتێكی جوان و گرانبەهای لەدەست بوو. ئەو كەسەی لە تەنیشتی دانیشتبوو هەندێ پرسیاری لەبارەی سەعاتەكەیەوە لێكرد. كچەكە كەمێك نارەحەت بوو. من هەر تەماشام دەكرد. ئەو پیاوە دەیویست سەعاتەكە ببینێت، كچەكەش حەزی نەدەكرد لە دەستی بكات. بەڵام سەرەنجام بەهۆی پێداگریی پیاوەكەوە، كچەكە سەعاتەكەی لە دەستی كردەوە. لەو كاتەدا تێگەیشتم گرفتەكە چی بووە. كچەكە پەڵەیەكی سپی گەورەی سروشتی لەسەر دەستی بوو. پەڵەكەی ڕێك لەژێر سەعاتە جوانەكەدا شاردبووەوە. ئێستا ئیتر رازی كچەكە ئاشكرا ببوو، لەبەر شڵەژان و شەرم ئارەقی كردبوو و زۆر شپرەزە و نائاسودە ببوو.

منەتیش ڕێك وەكو ئەو مەسەلەیە وایە. ترس هەیە، بەڵام هیچ كەسێك نایەوێ دەریبخات، چونكە ئەو كاتەی كە پیشانی بدەیت ئەترسیت، ئەوا كەسانی دەوروبەرتان زۆرتر ئەتترسێنن. كاتێك ئەوان كەموكورییەكانی تۆیان بۆ دەردەكەوێت، زۆر دەترسیت. ئەوان زەبرێكی توندت لێئەدەن. ئەوان خۆشی لە

سوککردنت دەبینن. هەر کە تێگەیشتن کەسێك هەیە لەوان لاوازترە، دڵیان پێ خۆش دەبێت و چێژ لە بەکاربردن و سەرکوتکردنی وەردەگرن.

بۆیە هەموو ئەو مرۆڤانەی کە دەترسن، لە قووڵایی ناوەوەیاندا (من)گەرایی دروست دەکەن تا ترسیان داپۆشێت.

(ئەدۆڵف هیتلەر)، (ئیدی ئەمین)ی فەرمانڕەوای پێشووی ئۆگەندا– و کەسانی وەکو ئەمانە– گەواهیدەری ئەو حاڵەتانەن، زۆر هەڵمساون! ئەو کاتە ئەوانیتر دەترسێنن. هەر مرۆڤێك کە هەوڵ دەدات ئەوانیتر بترسێنێت باش دەزانێت کە خۆی لە قووڵایی ناوەوەیدا زۆر دەترسێت ئەگینا بۆچی وا دەکات؟ مەبەستی لەم کارە چییە؟ چ کەسێك جگە لە مرۆڤێکی ترسنۆك زەحمەتی ترساندنی ئەوانیتر دەداتە بەر خۆی؟

ئـەو مرۆڤانـەی کـە تـرس هـەموو جەسـتەیانی گرتووەتەوە ئەوانیتر ئەترسێنن تاوەکو خۆیان بـە ئاسودەیی بژین. ئەوان باش دەزانـن کـە لـەم بارەدا لایەنی بەرانبەر حەقی نابێت بەسـەریانەوە و سنووری خۆی تێناپەڕێنێت.

# کابرای دەوڵەمەند و خزمەتکارەکانی

جۆرج گۆرجیف دەیگێڕایەوە: پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند کۆشکێك و خزمەتکاری زۆری هەبوون. ئەو مەبەستی بوو بچێتە سەردانێك کە لەوانەبوو سێ ساڵ بخایەنێت. گەڕانەوەی دڵنیا نەبوو.

پێش ڕۆیشتنی بە خزمەتکارەکانی وت: (بیرتان بێت، هەر ڕۆژێك بێ لەوانەیە بگەڕێمەوە. دەشێ سەردانەکەم تەواو نەکەم، بۆیە پێویستە بەردەوام چالاك بن و تەنبەڵی نەکەن. پێویستە ئەم ماڵە هەموو ڕۆژێك ئامادە بێت بۆ گەڕانەوەم، پاك و ڕێك و پێك بێت...و هەموویان وتیان ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن.

سێ ساڵ تێپەڕی: خزمەتکارەکان بەرەبەرە دەستیانکرد بە تەنبەڵی...ڕۆژانی سەرەتا هەموویان بە جۆش و خرۆش بوون ماڵیان پاك و ڕێك و پێك رادەگرت. لەوانەبوو هەر ساتێك بێت گەورەکەیان بگەڕێتەوە. بەڵام سێ ساڵی تر تێپەڕی- کاتێکی درێژ بوو- و خاوەن ماڵ نەگەڕایەوە. دەشێ مردبێت، دەشێ وازی لە دنیا هێنابێت، نەگەڕێتەوە....پاك راگرتن و ڕێکوپێك راگرتنی ماڵ پەیتا پەیتا وەستا. لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتکارەکان لەناو خۆیاندا بڕیاریاندا کە بە نۆرە هەر جارەی یەکێکیان لە دەرەوەی دەروازەی سەرەکیی کۆشك پاسەوانی بکات، لەوێوە دەیانتووانی دوورابیەکانی ڕێگاکە ببینن، تاوەکو ئەگەر کالیسکەکەی گەورەکەیان دەرکەوت، دەستبەجی ئەوانیتر ئاگادار بکاتەوە.و ئەوانیش دەستبەجێ کاری پێویستئەنجام بدەن ئەگینا پاککردنەوەی ماڵ بە کەڵکی چی دێت؟

خزمەتکارەکان بە نۆرە چاودێریی دەروازەی سەرەکیی کۆشکیان دەکرد. ئەو کۆشکە زۆر جوان بوو و بە تەنیا لەناو تەپۆلکەکان و دارستانەکە هەڵکەوتبوو. هەر کاتێك کە ڕێبوارێك بەوێدا رەت دەبوو لەو پاسەوانەی دەپرسی کە لە دەرەوەی دەروازەکە وەستابوو: (خاوەنی ئەم کۆشکە کێیە؟) هەموویان باوەڕیان وابوو و لە قووڵایی ناخیانەوە حەزیان دەکرد کە خاوەنی کۆشك هەرگیز نەگەڕێتەوە. بۆیە ئەو چاودێرەی کە لە دەرەوەی دەروارەکە ئەوەستا لە وەڵامی ڕێبوارەکەدا ئەیگوت: (هی منە. من خاوەنی ئەم کۆشکەم).

بەڵام ڕێبوارەکان سەریان سوڕمابوو، چونکە کاتێك هەر لەو ڕێگایەوە دەگەڕانەوە و ئەیانبینی کەسێکی تر لای دەروازەکە وەستاوە و ئەیانپرسی: (خاوەنی ئەم کۆشکە کێیە؟) ئەو دەیگوت (من خاوەنی ئەم کۆشکەم).

گۆرجیف لە گێڕانەوەکەی بەردەوام دەبێ: هەر یەکێك لە خزمەتکارەکان بە نۆرەی خۆی دەبووە خاوەنی کۆشك...و دۆخی (من)ەکانی تۆش کتومت وەهایە. ژمارەیەکی زۆری (من) لە تۆدا هەن. ئەگەر بە وردی بڕوانیت، ئەوا دەتووانیت ئەو (من)ە زۆرانە لە خۆتدا ببینیت، بەڵام لە هەر کاتێکدا (من)ێکی دیاریکراو بەسەر تۆدا زاڵە. ئەو (من)ە دەڵێت: (من خۆشم دەوێیت و بۆ هەمیشە عاشقی تۆم. ئەوانیتریش هەر عاشق بوون، بەڵام ئەی مەعشوقی من، تەنانەت ئەو کاتەش کە مردوویت خۆشم دەوێیت).

ساتێکیش دواتر، عاشقە گەورەکان دەکەونە ململانێ و شتەکان لە یەکتری دەگرن!

چی ڕوویداوە؟ چی بەسەر ئەو عەشقە گەورەدا هاتووە؟ ئەوە ڕاستییەکی زانراوە کە عاشقەکان دەشێ گیانیان فیدای یەکتری بکەن، دەشتووانن یەکتری بکوژن. ناشێ ئەمە کاری (من)ێك بێت. ئەگەر بەئاگا بیت، بۆت دەردەکەوێ کە

ریزێك لە (من) لە پشت سەرتەوەیە. (من)ێك دەیەوێ شتێك بڵێت. (من)ێکی تر دەیەوێ شتێکی تر بڵێت. (من)ەکەی تر دەیەوێ شتێکی تر بکات...وئەمانە قەت پێکەوە هەڵناکەن. شەڕێکی ناوخۆی بەردەوام لەئارادایە: (کێ خاوەنی ئەم کۆشکەیە؟)

# باشترین ئەسپی دنیا

گاوانێك بە ئەفسەرێكی وت باشترین ئەسپی دنیای هەیە:

(رۆژێكیان بە تولە رێیەكی ناو شاخەكاندا دەڕۆیشتم كە لە ئەسپ بەربوومەوە و پێم شكا!)

ئەفسەرەكە وتی: (نەڵێی ئەسپەكە پێیەكەمی چاك كردەوە!)

گاوانەكە وتـی: (نـا، بـەڵام بـە ددانـەكانی پشـتێنەكەمی گـرت و بردمییـەوە بـۆ ماڵەوە و پاشان پێنج كیلۆمەتر رێگەی بڕی تاوەكو بچێت دكتۆر بێنێت).

ئەفسەرەكە وتی: (خۆشحاڵم كە ئەسپێكی وەها زیرەكت هەیـە و هـەموو شـتێك بەباشی بەڕێوە چووە!)

گاوانەكـە وتـی: (بـە راسـتی وا نـەبوو. ئـەو ئەسـپە نەفرەتییـە چـوو پزیشـكی بەیتەری هێنا!)

چی لە ئەسپێك چاوەڕێ دەكرێ، ئەوەش لە زیادەیە!

ئەگەر بە لاساییكردنەوەی كەسێك هەر كارێك ئەنجام بدەیت ئـەوا بـەجۆرێك لـە جۆرەكان و لە شوێنێكدا مەبەستە بنچینەییەكە ناپێكیت. تـۆ لـە قۆناغێكـدا هەڵـە دەكەیت، چونكە لاسـاییكردنەوە واتـە ئەمـەی كـە لـە پێشدا ژیـانێكی گەمژانـەت قبوڵكردووە.

لاساییكردنەوە هیچ ئازارێك چارەسەر ناكات! تۆ تووشـی كێشـە دەبیـت. بۆیـە دەبێ تۆ ژیانی خۆت بەشێوەیەكی هۆشمەندانە بەرەو پێش ببـەیت و بـە شـێوازی

خۆت بژیت. تۆش ئەوەندە بێ هاوتایت کە تەنیا دەتووانیت بژیت و لاسایی ژیانی ئەویتر نەکەیتەوە...تۆ ئەوەندە رەسەنیت کە درک بەوە بکەیت ژیان وەکو کەسێکی تر تەنیا لەناوبردنی ئەم دیارییە مەزنەی خودایە. ئاوازی خۆت بخوێنە و بەردەوام بە لە سەماکەت و عەشقی خۆت دەربڕە...

# تابلۆی ساختەی پیکاسۆ

زەردەشت دەڵێت: (ئەگەر بەهرەیەکت هەیە و ئەم بەهرەیە هی خۆتە و شەرمەزارییەك نەبێت و تۆ خۆت بەدەستت هێنابێت، تۆ تیایدا لەگەڵ هیچ کەسێکدا هاوبەش نیت. ئەو بەهرەیە تایبەتە بە تۆ، وەکو شوێنپەنجەکانت هی تۆیە).

بەڵێ، هیچ کەسێکی تر لە دنیایدا ناتوانێت ئەو بەهرەیەی هەبێت. سروشت هەرگیز خۆی دووبارە ناکاتەوە. تەنانەت ئەو کاتانەش کە هەندێ شت هاوشێوە دیارن، تەنیا هاوشێوەن و یەك نین.

بڕوانە درەختێك، سەیری گەڵاکانی بکە. سەرت دەسوڕمێت. هەموو گەڵایەك تایبەتمەندیی خۆی هەیە. هیچ گەڵایەك کتومت وەکو گەڵایەکی تر نییە. بڕۆرە کەناری دەریا. گوێچکە ماسییەکان ببینە. هیچ کامیان کتومت وەکو ئەویتریان نییە. یان سەیری بەردەکان بکە، هیچ کامیان وەکو ئەویتریان نییە.

ئەفرێنەرێتی جیهانی بوون زۆر مەزنە. هەرگیز هیچ شتێك دووبارە ناکاتەوە. بیستووتە دەڵێن: (مێژوو هەرگیز خۆی دووبارە ناکاتەوە) بەڵام من پێتان دەڵێم ئەمە راست نییە. مێژوو دووبارە دەبێتەوە، تەنیا جیهانی بوونە کە قەت دووبارە نابێتەوە. مێژوو دووبارە دەبێتەوە، چونکە لەناو دەستانی مرۆڤی ناهۆشیاردایە. خەڵکی هۆشیار ناتوانن ناياب بن.

ڕۆژێکیان پیاوێك تابلۆیەکی پیکاسۆی بە بڕی یەك ملیۆن دۆلار کڕی. ئەو دەیویست دڵنیا بێت لەوەی کە تابلۆیەکە ئەسڵیە و ساختە نییە، چونکە تابلۆی زۆر لە بازاڕدا هەن کە کتومت لە تابلۆ ئەسڵیەکان دەچن. تا ئەوەی کە ڕەخنەگرێکی بەئەزموون نەبێت، ناسینەوەی جیاوازی مەحاڵە. بۆیە لەگەڵ پسپۆڕێکی تابلۆکانی پیکاسۆ ڕاوێژی ئەنجامدا.

پسپۆڕەکە بە کڕیاری تابلۆکەی وت: (نیگەران مەبە. من لە ڕەسەنایەتی ئەم تابلۆیە دڵنیام، چونکە پیکاسۆ کاتێك وێنەی دەکێشا، من لەماڵەکەی ئەو بووم. بۆیە من گەواهیدەرێکی زیندووم. نابێ نیگەران بیت. پارەکەت بەفیڕۆ نەچووە).

بەڵام ئەو پیاوە وتی: (من حەز دەکەم لەگەڵما بێیت بۆ ماڵی پیکاسۆ. دەمەوێ بۆچوونی خودی پیکاسۆش بزانم).

پیاوەکە وتی: (قەیچێکا).

ئەو دووانە پێکەوە چوونە ماڵی پیکاسۆ. کچێك لەوێ بوو. پیکاسۆ سەیرێکی تابلۆکەی کرد و وتی: (ساختەیە).

پسپۆڕەکە وتی: (ئەوە دەڵێی چی؟ کاتێك ئەم وێنەیەت دەکێشا من لەوێ بووم). ئەو کچەی لای پیکاسۆش بوو وتی: (منیش ئەو کاتەی کە ئەم وێنەیەت دەکێشا لەوێ بووم).

پیکاسۆ وتی: (نەموت ئەم وێنەیەم نەکێشاوە، بەڵام ساختەیە!) هەموویان سەیری پیکاسۆیان کرد. ئایا شێت بووە! پیکاسۆ وتی: (ئێوە تێناگەن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە پیاوێك داوای تابلۆی منی دەکرد و منیش هیچ سروشێکم بۆ نەدەهات. بۆیە من تەنیا یەکێك لە نیگارە کۆنەکانی خۆمم کێشایەوە. دەتوانن بچنە مۆزەخانەی پاریس و ڕەسەنەکە لەوێ ببینن. من هەر

ئەو تابلۆیەم دووبارە کێشاوەتەوە. کەواتە لەکاتێکدا کە من ئەمەم کێشاوە، ئەم تابلۆیە رەسەنەکە نییە. کۆپییە. ئەمەی کە ئەم کۆپییە لەلایەن منەوە کێشراوە هیچ گرنگ نییە، کۆپی هەر کۆپییە، ساختەیە).

# ئەقڵ و دڵ

هۆشمەندی واتە ئەقڵ کاتێك ژیری لەگەڵ دڵتدا هاوئاهەنگە.

دوو دەرۆزەکەر لە دەرەوەی گوندێکدا دەژیان. یەکێکیان نابینا بوو و ئەویتریان قاچی نەبوو. رۆژێکیان دارستانێك کە نزیکی گوندەکە بوو و ئەو دووانە تیایدا دەژیان، ئاگری گرت. ئەو دوو دەرۆزەکەرە لە پیشەکەی خۆیاندا رکابەرێتییان دەکرد و هەمیشە لە یەکتری تورە بوون. ئەوان نەك تەنیا هاوڕێ نەبوون بەڵکو دوژمنی یەکتری بوون. بۆیە کاتێك کە دارستانەکە ئاگری گرت، ئەو دوو دەرۆزەکەرە بۆ ساتێك بیریان کردەوە. ئەوان دوژمنی یەکتری بوون، بەڵام ئێستا ئیتر حاڵەتێکی ئیمێرجێنسی بوو. پیاوە کوێرەکە بەوەیانی وت کە قاچی نەبوو: (ئێستا تاکە رێگا بۆئەوەی کە رابکەین ئەوەیە لەسەر شانی من دانیشیت و قاچەکانی من بەکار بێنیت و منیش سوود لە چاوەکانی تۆ وەردەگرم. ئەمە تاکە رێگایە بۆئەوەی خۆمان رزگار بکەین).

ئەم پێشنیارە بە ئاسانی و خێرا قبوڵ کرا. کێشەیەك نەبوو. پیاوە بێ قاچەکە نەیدەتووانی بەبێ قاچ لەوێ دەرچێت، مەحاڵ بوو بۆی کە لە دارستان بچێتە دەرەوە، چونکە هەموو دارستان ئاگری گرتبوو. ئەو دەیتووانی کەمێك بجوڵێت. بەڵام نەیدەتووانی بچوکترین یارمەتی ئەویتر بدات.

ڕاکردنێکی خێرا پێویست بوو. کابرای کوێریش دڵنیا بوو لەوەی کە ناتووانێت لەو دارستانە بچێتە دەرەوە. ئەو نەیدەزانی ئاگر لە کام لای دارستانەکەوەیە و جادەکە لە کام لایە. لە کم لاوە درەختەکان دەسوتێن و لەکام لاوە درەختەکان هێشتا نەسوتاون...بۆیە کابرای کوێر ون دەبوو. بەڵام هەردووکیان مرۆڤی ژیر بوون، چونکە دوژمنایەتی نێوان خۆیان بەلاوەنا و ببوون بە هاوڕێ بۆیە گیانی خۆیان ڕزگار کرد.

ئەمە ئەفسانەیەکی خۆرهەڵاتییە. ئەم ئەفسانەیە لەبارەی ئەقڵ و دڵی تۆیە. ئەم چیرۆکە پەیوەندی بە دەرۆزەکەرەکانەوە نییە، پەیوەندی بە تۆوە هەیە. پەیوەندی بەو دارستانەوە نییە کە ئاگری گرتووە، بەڵکو پەیوەندی بە تۆوە هەیە، چونکە تۆ لە ئاگردایت. هەموو ساتێك خەریکە دەسوتێیت لە زەحمەتدا، لە نەگبەتیدا، لە شڵەژان و دڵەڕاوکێدا. ئەقڵی تۆ بە تەنیایی کوێرە، بەڵام قاچی هەیە، دەتووانێت خێرا رابکات، بەڵام لەبەرئەوەی کوێرە ناتووانێت ئاراستەی ڕاست بۆ ڕۆیشتن هەڵبژێرێت و بۆیە ئاشکرایە کە بەردەوام ساتمە دەکات، ئەکەوێت، زیانی پێدەگات و ژیان بەشێوەیەکی بێمانا هەست پێدەکات. ئەمەیە کە ڕۆشنبیرانی هەموو دنیا دەڵێن: (ژیان بی مانایە). هۆی ئەمەی کە بۆچی دنیا لە چاوتاندا بێ مانایە ئەوەیە کە ئەقڵی کوێر دەیەوێ ڕووناکی ببینێت و ئەمەش ئەستەمە. دڵێکیش لە ئێوەدا هەیە کە دەبینێت و هەست دەکات، بەڵام پێی نییە و ناتووانێت بڕوات. هەر لەو شوێنەی کە لێیەتی دەمێنێتەوە و خەریکی لێدانە و چاوەڕوانە....ڕۆژێك دێ ئەقڵ تێدەگات و دەتووانێت چاوەکانی دڵ بەکار بێنێت.

کاتێك وشەی (متمانە) دەردەبڕدرێت، مەبەست لێی چاوەکانی دڵە و کاتێك وشەی (گومان) دەردەبڕدرێت مەبەست لێی قاچەکانی ئەقڵی تۆیە.

ئەم دووانە هەردووکیان دەتووانن پێکەوە لە ئاگرەکە بێنە دەرەوە. قەت هیچ کێشەیەک نییە، بەڵام بیرت بێت دەبێ ئەقڵ قبوڵی بکات کە دڵ بکەوێتە سەر شانەکانی. ناچارە گوێ لە دڵ بگرێت و پەیڕەوی ئەو ئاراستانە بکات کە دەستنیشانیان دەکات.

لەناو دەستەکانی دڵدا، ئەو هۆشمەند دەبێت. ئەمە گۆڕانێکە، گۆڕانێکی تەواوی وزە. لەم حاڵەتەدا تاکەکەس نابێتە خاوەنی بیر، بەڵکو ژیر دەبێت و ژیریش لە بە یەکگەیشتنی دڵ و ئەقڵ بەرهەم دێت و بۆیە کاتێک فێری هونەری هەماهەنگکردنی لێدانەکانی دڵ و کرداری ئەقڵ بوویت، هەموو رازەکانت لە دەستدایە، واتە ئەو کلیلە سەرەکییەی کە هەموو رەمزەکان دەکاتەوە.

## ئەم هەموو جیاوازییە لە کویوە هاتووە؟

ئەم چیرۆکە لە سەردەمی یەکێك لە گەورەترین مۆسیقارەکانی هیند بەناوی (تانسن) روویداوە کە لە کۆشکی ئەکبەرشا دا دەژیا. رۆژێکیان ئەکبەرشا پرسیاری لە تانسن کرد: (پێم وا نییە لە زانینی مۆسیقا و ژەنیندا کەسێك بتوانێ پێش تۆ بکەوێتەوە. پێدەچێ شتێکی وەها ئەستەم بێت. بەلاَم من هەرکاتێك بیر لەم مەسەلەیە دەکەمەوە، پێم وایە دەبێ مامۆستایەکت هەبێ کە ژەنینی لێوە فێر بوویت. بە دڵنیاییەوە ئەو لە تۆ لێهاتووترە. بڵێ ئەو مامۆستایە کێیە؟ ئایا هێشتا زیندووە؟ ئەگەر زیندووە بانگهێشتی بکە بۆ کۆشك).

تانسن لە وەلاَمدا وتی: (بەڵێ ئەو زیندووە، بەلاَم ناکرێ بۆ کۆشك بانگهێشت بکرێت. ئەو وەکو ئاژەڵێکی درندە وایە. ئەو بەهیچ شێوەیەك کۆمەلاَیەتی نییە. بەڵکو وەکو هەورەکان بەردەوام خەریکی جوڵە و سەفەرە. ئەو لە هیچ شوێنێك رەگ داناکوتێت و ئاوارە و بێ ماڵ و حاڵە. هەروەها ناشکرێت داوا بکەیت بێت و گۆرانی بڵێت یان مۆسیقا لێ بدات، بەڵکو دەبێ بچینە لای و ئارام بگرین و چاوەڕێ بین).

ئەکبەر شا زۆر تامەزرۆی ئەو کابرایە ببوو و بڕیاریدا بچێتە دیدەنی. مامۆستاکەی تانسن ناوی (هاریداس) بوو. تانسن گروپێکی نارد تاوەکو بگەڕێن و شوێنی نیشتەجێبوونی هاریداس بدۆزنەوە.

ئەم گروپە پاش گەڕان بۆیان دەرکەوت کە ئەو لە نزیك رووباری (جمنا) لە کۆڵێتێکدا دەژیت.

ئەکبەرشا و تانسن بۆ بینینی هاریداس چوونە ئەو شوێنە. ئەو خەڵکانەی کە لە نزیکیی شوێنی نیشتەجێبوونی هاریداس دەژیان بەوانیان وت: (هەندێ جار نزیکی سەعات سێی بەرەبەیان ئەم کابرایە دەست دەکات بە گۆرانی وتن و سەما دەکات، بەڵام بە درێژایی رۆژەکە بە تەواوی بێدەنگ دەبێت و جوڵەی لێدەبڕێت).

ئەکبەرشا و تانسن دوای نیوەی شەو، لەکاتێکدا کە وەکو دز خۆیان شاردبووەوە، لە پشت کۆڵێتەکەی هاریداس چاوەڕوان بوون، نیگەرانی ئەوەش بوون هاریداس بزانێ لەوێن و گۆرانی نەڵێت و سەما نەکات.

پاش کەمێك هاریداس دەستیکرد بە گۆرانی وتن و سەما کردن.

ئەکبەرشا مات و مەلول ببوو و نەیدەتووانی تەنانەت قسەیەکیش بکات و بەردەوام دەگریا. تەنانەت ئەو کاتەش کە هاریداس لە گۆرانی و سەما وەستا، ئەکبەرشا بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو و فرمێسك لە چاوانی دەهاتە خوار.

کاتێك دواجار گەڕانەوە بۆ کۆشك، ئەکبەرشا بە تانسنی وت: (پێم وابوو کەسێکی تر نییە لە زانینی مۆسیقا لە تۆ لێهاتووتر بێت، بەڵام ئەمڕۆ کە هاریداسم بینی بۆم دەرکەوت کە تۆ لەگەڵ مامۆستاکەتدا بەراورد ناکرێیت. بۆچی جیاوازیی نێوانتان ئەوەندە زۆرە؟)

تانسن لە وەڵامدا وتی: (هۆکاری جیاوازەکە زۆر ئاشکرایە. من گۆرانی دەڵێم و مۆسیقا دەژەنم بۆئەوەی شتێکم دەست بکەوێت، پارە، پێگەی کۆمەڵایەتی و ستایشی ئەوانیتر.

لە راستیدا هونەر ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تر. مامۆستاکەی من بە تەواوی پێچەوانەی ئەم حاڵەتەیە. ئەو گۆرانی دەڵێت و مۆسیقا دەژەنێت چونکە

شتێکی پێیە. ئەو تەنیا ئەو کاتە گۆرانی دەڵێت کە هەست دەکات لە ناخیدا شتێکی هەیە دەریبرێت. لەم بارەدا گۆرانی و مۆسیقاکەی شتێکە کە لە ناوەوەیدا هەیە. کاتێك ئەو پڕە لە هەستی ئاسمانی و رۆحانی کە ناتوانێ چیتر هەڵیگرێت، دەست دەکات بە گۆرانی وتن و ئەم کردارەی لە راستیدا لە هەستی مەعنەوی ناو ناخی دەڕژێتە دەرەوە. ئەو بۆ ئەوە گۆرانی ناڵێت تا شتێکی دەست بکەوێت، بەڵکو هونەری ئەو بەشێوەیەکی خۆبەخۆ ئامانجەکەیەتی).

جیاوازیی نێوان عەشقی مەجازی و عەشقی راستەقینەش هەر لەمەدایە. عەشقی راستەقینە ئایندەیەکی نییە. عەشقی راستەقینە زۆر بە سادەیی لە ئێستادا هەموو شتێك دەکاتە ئاهەنگ.

عیبادەتی تۆش جۆرێکە لە ئاهەنگ و شادی. عیبادەت بەهیچ شێوەیەك هەوڵێك نییە بۆ بەدەستهێنانی شتێکی تر. ئەو ساتانەی کە عیبادەتی راستەقینە روودەدات، ساتی نەمر و تاهەتایین.

بەندەیەکی راستەقینە هەرگیز ساتەکان نازمێرێت. ساتێکی عیبادەتی راستەقینە ئەوەندە دەوڵەمەندە کە کەسەکە بە تەواوی رازی و دڵخۆش دەکات، بە جۆرێك کە ئەو چیتر بەدوای شتێکی ترەوە نییە. ساتەکانی بەندایەتی، بە تەواوی دەوڵەمەندت دەکات و لەم ساتانەدا تۆ بوونت نییە.

# دەستگیر و سێ ژنی تۆمەتبار

دەستفرۆشێکیان گرت و بردیانە دادگا. ئەو تازە هاتبووە ناو شار و بێ ئەوەی کە مۆڵەتی هەبێت کاری دەستفرۆشی دەکرد. بەڵام دەشیزانی کە بۆ دەستفرۆشی، مۆڵەت پێویستە. کاتێك بردیانە دادگا، بینی کە ژمارەیەك تاوانباری تریشیان هێناوەتە لای دادوەر، سێ ژنیان بە تۆمەتی لەشفرۆشی دەستگیر کردبوو.

ئەوانیش مۆڵەتی پێویستان نەبوو. دنیایەکی سەیر و نامۆیە! حکومەت بۆ لەشفرۆشیش مۆڵەت دەدات! ئەو سێ ژنە مۆڵەتیان نەبوو. دادوەر لە یەکێك لەوانی پرسی: (چیت هەیە بیڵێیت؟ چی ئەکەیت و بە چ کارێکەوە سەرقاڵیت؟) ژنەکە لە وەڵامدا وتی: (من نمایشکارێکم.) ئەو درۆی دەکرد. دادوەر ئەوی بە سێ رۆژ کاری قورس مەحکوم کرد. پاشان هەمان ئەو شتانەی لە ژنی دووەم پرسی. ژنی دووەم لە وەڵامدا وتی: (قوربان هەڵەیەك روویداوە. من هونەرمەندێکم).

دادوەر ئەوی بە شەست رۆژ کاری قورس مەحکوم کرد. پاشان روویکردە ژنی سێیەم. ژنی سێیەم وتی: (گەورەم! من بە کاری لەشفرۆشییەوە سەرقاڵم). دادوەر کە باوەڕی نەدەکرد ئەو ژنە ئەوەندە راستگۆیە ، پێی وت: (راستگۆیی ئەوەندە دەگمەنە کە تۆ بەو راستگۆییەت غافلگیرت کردم. تۆم بەهۆی راستگۆییەکەت بەخشی. تۆ سزا نادەم). پاشان نۆرەی دەستگیرەکە هات.

دادوەر لێی پرسی: (تۆ چیت کردووە؟) دەستگێرەکە کە بینی لەشفرۆشەکە بە چ پاساوێك قوتار بووە، خۆی نارەحەت کرد و بە روخسارێکی قوربانییەوە وەك بڵێی دەستبەجێ دەبەخشرێت و دەچێتە دەرەوە، وتی: (راستییەکەت پێ بڵێم قوربان، منیش سەرقاڵی کاری لەشفرۆشیم).

مامۆستا دەڵێت: (ئەوە بۆخێکی ریاکارانەیە کە خەڵکی تووشی بوون. خۆدەرخستن و ریا و فریودان...تۆ تەنانەت ئاگاداریش نیت کە چۆن فریو ئەدەیت و کێ فریو ئەدەیت. تۆ خۆت فریو دەدەیت تا رابکەیت. تۆ دەتەوێ خۆت بشاریتەوە).

# رۆژی لەسێدارەدان

رۆژی لەسێدارەدان بوو و کابرای خراپەکاریان هێنابووە بەردەم پەتی سێدارە. کاتێك گەیشتنە بەردەم پلیکانەکانی سەکۆکە، کابرای خراپەکار لەناکاو وەستا و ئیتر هەنگاوێکیش نەچووە پێشەوە. پاسەوانەکە وتی: (دە برۆ چی بووە؟)

کابرای خراپەکار وتی: (ئەم پلیکانانە زۆر کۆن و رزیون، پێناچێت بایی پێویست سەلامەت بن تا بەسەریاندا سەر بکەوم). ئەو خەریکە لە سێدارە دەدرێت، بەڵام ئەو پلیکانانە هیچ سەلامەت نین و رۆیشتن بەسەریاندا سەلامەت نییە! تەنانەت لە سەروەختی مردنیشدا مرۆڤ هەر بەردەوامە و پەیوەستە. تاوەکو دوا هەناسە هیچ کەسێك نایەوێ بمرێت. تا ئەو کاتەی کە فێری مردن نەبیت، قەت ناتووانیت بژیت. هەرگیز ناتووانیت ژیان بناسیت. کەسێك کە دەتووانێ بمرێ، کەسێکە کە دەتووانیت بژیت، چونکە مەرگ و ژیان دوو رووی دراوێکن.

# هۆکاری مردن

خاتوو (کوچران) لەبەردەم تەرمی هاوسەرەکەی وەستابوو. کوڕەکەشی لەلا بوو. ماتەمگێڕان بەلایدا ڕەت دەبوون.

(ئێستا چیتر ئازار ناچێژێت).

خاتوو (کرۆی) وتی: (هۆکاری مردنی چی بوو؟)

خاتوو کوچران وتی: (بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە مرد!)

لەپڕ کوڕەکە دایکەکەی بردە لاوە: (دایکە، ئەوەی کە لەبارەی باوکمەوە وتت ناشیرینە. ئەو خۆ بە نەخۆشی ئایدز نەمرد. بە سکچوون مرد).

خانم کوچران وتی: (دەزانم، بەڵام وام پێ باشە کە خەڵکی وا بیر بکەنەوە کە ئەو وەکو کەسێکی باش مرد، لەبری ئەو پۆخڵەواتەی کە بوو).

تا ساتەکانی کۆتایی بەردەوام دەبن لە گەمەکانی خۆیان...

خۆپەرستی ڕێگە نادات راستەقینە بێت، ناچارت دەکات درۆزن بیت. خۆپەرستی درۆیە. بەڵام تاکەکەس دەبێ بڕیار بدات. بۆ شکاندنی ئەوەی کە تاوەکو ئێستا پێیگەیشتوویت، پێویستت بە ئازایەتییەکی سەرووئاساییە. درۆ هەموو رابردووتان وردوخاش دەکات. بەتەواوی ورد دەبیت. کەسێك لەوێیە، بەڵام تۆ ئەو کەسە نیت. بوونێکی جودا لە تۆدا دەردەکەوێت، بوونێك کە بە رابردوو پیس نەبووە. ئەو کاتە هیچ دیوارێك بوونی نابێ. لە هەر کوێیەك بیت، لە فراوانیدا سنوورەکان نابینیت.

# پیرەمێرد و کارگوزار

پیرەمێردێکی چووە کافتریا دڵخوازەکەی خۆی و بۆی دەرکەوت کە کارگوزارەکەیان گۆڕیووە. لەبەرئەوەی سەرەتا کەمێك سەری سوڕمابوو، بە ڕێزەوە بە کارگوزارە نوێکەی وت: (تۆ جوانترین کچی کە تاوەکو ئێستا بینیوومە !)

کارگوزارە نوێکە کە کابرایەکی لوتبەرز بوو، سەری لەقاند و بە گرژ و مۆنییەوە وەڵامی دایەوە: (بمبوورە کە ناتووانم گفت شیرینییەکەت وەڵام بدەمەوە).

پیرەمێرد بە نەرمییەوە وەڵامی دایەوە: (باشە ئەزیزم، ئایا ناتووانی کارێك بکەیت کە من ئەنجامی دەدەم؟ ناتووانی درۆ بکەیت؟)

هەموو گفت و لفت شیرینییەکانمان شتێك نین جگە لە یارمەتیدانی خۆپەرستیی یەکتری. ئەمانە درۆن. تۆ شتێك بە کەسێك دەڵێیت و ئەویش بە گفت شیرینی وەڵام دەداتەوە. نە تۆ و نە ئەو هیچ کامتان راست نین. نەریتی گفت شیرینی، یەکتر دواندن، گەرم و گوڕی، رووکەش و دەمامکی شارستانییانەن.

هەندێ جار ناچاریت رووبەڕووی دیوار بیتەوە و پەیتا پەیتا دیوارەکە گەورە دەبێت، ئەوەندە گەورە دەبێت کە ناتووانیت شتێك ببینیت. هەموو رۆژێك دیوارەکە گەورەتر دەبێت، بۆیە دوا مەکەوە. ئەگەر پێتان وایە دیوارێکتان لە دەوری خۆتان دروست کردووە، وازی لێ بێنن! باز بدەنە دەرەوەی! بۆ بازدان تەنیا بڕیاردان پێویستە، نەك شتێکی تر. لە سبەینێوە ئیتر خۆراکی مەدەنێ.

دوای ئـەوە هــەر کاتێـك کـە هەسـت دەکـەیت دووبـارە بایـەخی پێـدەدەیت، بوەستە. دوای چەند رۆژێك بۆت دەردەکەوێت کـە مـردووە، چـونکە پێویسـتی بـە پارێزگاریی بەردەوامی تۆ هەیە. پێویستی بە خۆراکپێدانە.

# وازهێنان له جگەره

موریدێك لەبارەی کێشـەی جگەرەکێشـانەوە پرسـیاری لـە مامۆسـتاکەی کـرد. مامۆستا له وەڵامیدا ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕایەوە:

پیاوێك بەدەست سەرماخوردەگییەکی ئاساییەوە دەیناڵاند، هەموو پزیشـکەکان له بەرانبەریدا دەستەوسان بوون، چونکه هیچیان نـەیانتوانیبوو چارەسـەرێکی بـۆ بدۆزنـەوە. ڕۆژێکیـان پزیشـکێکی نـوێ هاتـە نـاو شـار. هـەموو پزیشـکەکانی تـر هۆشدارییان دایه ئەم پزیشکه تازه هاتووه و پێیان وت: (ئاگاداری ئەم کابرایـە بـە ! سەرماخوردەگییەکەی چارەسەری نییه).

کەواته هەر بەو شێوەیەی که پزیشکانی شار پێشبینییان کردبوو، ئەم کابرایه به زوویی دەرکەوت.

پزیشکه تازەکه وتی: (من دەتوانم چارەسەرت بکەم و دەبـێ تـۆ شـتێك بکـەیت (دیار بوو که وەرزی زستانه). سبەی بەیانی زوو پێش خۆرهەڵات بڕۆ بـۆ دەریاچـە و به رووتی له ئاوەکەدا مەله بکه و پاشان لەبەر شنەبای بەیان له کەناری دەریاچـەکه پیاسه بکه). کابرای نەخۆش وتـی: (ئەوە چی دەڵێیت؟ تۆ شێت بوویت؟ ئـەم کـاره چۆن دەتوانێ سەرماخوردەگییەکەی من چارەسەر بکات؟) پزیشکەکه وتـی: (کـێ وتی سەرماخوردەگییەکەی تۆ چارەسەر دەکات؟! تۆ بەم کاره تووشی ئەنفلەوەنزا دەبیت و ئەو کاته دەتوانم چارەسەرت بکەم).

بیرت بێـت: یـەکێك لـە یاسـا بنچـینەییەکانی ئاگـایی ئەوەیـە کـە لـە یـەك سـاتدا دەتوانێـت بـە یـەك شـتەوە قـاڵ بێـت، ئاگـایی مـرۆڤ تاکڕەهەنـدە. کەواتـە ئەگـەر

سەرقاڵی جگەرەکێشانیت و بیری لێ دەکەیتەوە، لە هەموو قاڵبوون و شپرزەییەکانی تر لادەدەیت.

گرفتی سەرەکی هەر عادەتەکەیە. تۆ دەڵێیت: (سەرسەختانە هەوڵمداوە، بەڵام هەمیشە شکستم هێناوە).

ئەو کارەی کە تۆ هێشتا ئەنجامت نەداوە، بەدەستهێنانی هۆشیاری و پەروەردەکردنییەتی لەبارەی خووەکەتەوە. تۆ هەوڵتداوە خووی خۆت واز لێبێنیت، بێ ئەوەی کە هەوڵ بدەیت لە ناوەڕۆکی خووەکەت بەئاگا بێیت. ئەم ئەستەمە، چونکە ئاگایی تۆ هەر ئەوە بووە کە هەیە. پێداویستییەکانی هەر ئەوەیە کە بووە، ئازارەکانی هەر ئەوەیە کە بووە و کاتێك کە ئەو شڵەژانانە ئەوروژێن، تۆ چی ئەکەیت؟ دەستبەجێ و خۆبەخۆ بەدوای جگەرەدا دەگەڕێیت.

لەوانەیە چەندان جار بڕیارت دابێت خوویەك واز لێبێنیت و چەندان جاریش شکستت هێنابێت. نەك لەبەرئەوەی کە جگەرەکێشان دیاردەیەکی ئەوەندە گەورەیە کە تۆ ناتوانیت لێی دەرباز بیت، بەڵکو لەبەرئەوەی کە تۆ لە خاڵی پێچەوانەوە دەستت پێکردووە، لەبری ئەوەی کە لە هەموو رەهەندەکانی کارەکە بەئاگا بێیت کە (بۆچی لە بنەڕەتدا جگەرە دەکێشیت؟) لەبری ئەوەی کە لە کرداری جگەرەکێشان هۆشیار بیتەوە هەروا بە سادەیی هەوڵ دەدەیت

وازی لێ بێنیت. وەکو ئەوە وایە کە بەبێ بڕینی رەگ و ریشەکان بتەوێ لە لێکردنەوەی گەڵاکان درەختەکە لەناو ببەیت!

لێرەدا هەموو سەرنجەکە لەسەر بڕینی رەگ و ریشەکانە نەك لێکردنەوەی لق و گەڵاکان. بە لێکردنەوەی گەڵاکان درەختەکە بەهێزتر دەبێت. لە راستیدا نەك تەنیا درەختەکە لەناو دەبەیت بەڵکو یارمەتیدەری گەشەکردنی دەبیت. ئەگەر بە راستی دەتەوێ لەم خووە رزگار بیت، دەبێ قووڵتر بڕوانیت.مەڕوانە ئەوەی کە دیارە، بەدوای رەگ و ریشەکاندا بگەڕێ.

# دەوڵەمەندی هەژار

(تا ئەو کاتەی کە وابەستەیی هەیە، کۆتیش هەیە).

تا ئەو کاتەی کە ئاگایی تۆ شتێکی تر یان کەسێکی تر جگە لە خۆتان سۆراخ بکات، لە کۆیلایەتیدایت.

سەردەمانێك پیاوێکی هەژار هەبوو کە لە سوچێکی شەقام دادەنیشت و خەڵك پارەیان دەدایە. ئەو خۆی داوای هیچ شتێکی لە کەس نەدەکرد. رێبواران خۆیان بەلایدا رەت دەبوون و پارەیان بۆ هەڵدەرشت. خەڵکی زۆر میهرەبان بوون بۆی. بە تێپەڕینی کات، کۆڵێتەکەی پڕ بوو لە پارە. کاتێك نۆرەی مردنی هات وتی: (من دەمەوێ هەموو ئەم پارانە بدەمە خەڵکی هەژار). بۆیە هەژارانێکی زۆر لە دەوری کۆ بوونەوە. هەر کامێکیان خۆی هەژارتر لەویتر پیشان دەدا. بەڵام هەژارەکە بە کورتی دەیگوت: (ئارام بگرن، هێشتا هەژارترین کەس نەگەیشتووە).

پاشا لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیدا بەو ناوەدا رەت دەبوو. ئەو هەژارە بە دەنگی بەرز بانگی پاشای کرد: (تکایە ساتێك بوەستە، تکا دەکەم وەرە و ئەم پارانە ببە).

ئەو مرۆڤە هەژارانەی کە لە دەوری کۆ ببوونەوە رەخنەیان گرت و وتیان ئەمە دادپەروەرانە نییە. ئێمە پێمان وانەبوو تۆ کارێکی وەها بکەیت! تۆ هەموو پارەکانت دایە پاشا؟

کابرای هەژار وەڵامی دایەوە: (لەم وڵاتەدا کەس لەو هەژارتر نییە. تۆ بەو شتە کەمانەی کە هەتە رازی و دڵخۆشیت، بەڵام ئەو وێڕای ئەو هەموو سامان و داراییە ناڕازییە. دیارە کە هەژاریی ئەو زیاترە. هیوا و ئاواتەکانی، کۆتایی نییە. لەوانەیە بەم پارانە تینووایەتییەکەی کەمێك کەم بێتەوە).

هەژار، هەژارە، بەڵام دەوڵەمەندیش هەر هەژارە. کەسێك کە شکستی هێناوە بە راستی شکستخواردووە. بەڵام ئەگەر بە وردییەوە بڕوانیتە ئەو کەسەش کە سەرکەوتووە، بۆت دەردەکەوێت ئەویش شکستخواردووە. هیچ رێگایەك لەم جیهانەدا نییە کە تیایدا سەرکەوتوو بیت. شکست تاکە کرداری ئەم جیهانەیە. هەمووان هەر شکستخواردوو دەبن. تەنیا یەك کەس سەرکەوتوو دەبێت، ئەویش ئەو کەسەیە کە بەدوای خۆیدا دەگەڕێت.

# ژماردنی مەڕەکان

(هۆرنشتاین) بەرهەمهێنەری جل و بەرگ بوو. بەڵام باروودۆخی بازاڕ ئەوەندە خراپ بوو کە نەگبەتە شەوان خەوی پیا نەدەکەوت. هاوڕێکەی پێی وت: (شەوان کاتی خەوتن، مەڕەکان بژمێرە. ئەمە باشترین دەرمانی بێخەوییە).

هۆرنشتاین وتی: (باشە! خۆ من هیچم لەدەست ناچێت. ئەمشەو تاقی دەکەمەوە).

سبەی ڕۆژی دواتر کابرای نەگبەت چاوەکانی زیاتر پەمەیی و ئاوسابوون. هاوڕێکەی لێی پرسی: (چییە؟ مەڕەکانت ژمارد؟)

هۆرنشتاین ناڵەیەکی کرد و وتی: (ژماردنێکی چۆن! تا پەنجا هەزارم ژمارد، پاشان خورییەکەیانم لێکردەوە تاوەکو پەنجاهەزار جلی زستانە دروست بکەم، بەڵام ئەو گرفتەی کە نەیهێشت بخەوم ئەوە بوو کە لە کوێ پەنجا هەزار پارچە بۆ ئەو جلانە پەیدا بکەم؟!)

بەڵێ، هیچ کام لەم کارانە یارمەتیدەر نابن، چونکە ئەگەر ئاگاییەکە هەمان ئاگایی کۆن بێت، دووبارە هەمان کێشەکان لە ڕێگەی جیاجیاوە دەردەکەونەوە. دەبێ ڕەگ و ڕیشەکان بگۆڕێن، ئەگینا لێکردنەوەی لق و پۆپ یارمەتیدەر نابن. دەتوانیت خوویەك سەرکوت بکەیت، بەڵام ئەو خووە لە شوێنێکی ترەوە

سەرهەڵدەداتەوە. دەتووانیت دەرگایەك دابخەیت، بـەڵام دەسـتبەجێ دەرگایـەکی تر دەکرێتەوە.

کاتێك ئەو دووەم دەرگایەش دابخەیت، ئەوا دەرگای سێیەم بەناچاری دەکرێتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا تۆ هەر ئەوەیت، هەر ئەو کەسە ناهۆشیارەی پێشوویت.

# چیرۆکی دوو عاشق

دوو عاشق لە کەناری دەریا دانیشتبوون. مانگەشەو بوو و مانگ لە سەرانسەری ئاسماندا دەدرەوشایەوە و شەپۆلی گەورەگەورە لەسەر ئاستی دەریا هاتبوونەکایەوە. پیاوەکە بە دەنگێکی بەرز بە دەریای وت: (ئێستا شەپۆلی گەورەتر بێنە. بەرز بەرەوە. شەپۆلە مەزنەکانت پیشان بدە). شەپۆلە مەزنەکانیش لە ئاستی دەریا بەرز بوونەوە و بەرەو کەنار هورووژمیان هێنا.

ژنەکە نزیکتر کەوتەوە و وتی: (ئا، من پێشتر دەمزانی کە تۆ موعجیزەیەکیت! تەنانەت شەپۆلەکانی دەریاش پەیڕەویت لێ دەکەن!)

بەڵێ، وایە. ژن ستایشی پیاو دەکات و پیاو پیاهەڵدانێکی دوو لایەنە گوێبیست دەبێت. ژنەکە دەڵێت: (هیچ کەسێك ئەوەندەی تۆ بەهێز و باش نییە! تۆ گەورەترین مرۆڤیت کە خودا دروستیکردووە. تەنانەت ئەسکەندەری گەورەش بە تۆ بەراورد ناکرێت!) و تۆش پف دەدرێیت، سنگت دەبێتە دووئەوەندە و سەرت با دەکات و تۆ بە ژنەکە دەڵێیت: (تۆ گەورەترین دروستکراوی خودایت. تەنانەت کیلۆپاتراش ئەو جوانی و شۆخ و شەنگییەی تۆی نەبوو. هیچ ژنێك وەکو تۆ جوان دروست نەبووە!) ئەمە ئەو شتەیە کە تۆ بە عەشق لەقەڵەمی دەدەیت! ئەمە واتە خۆشەیدایی. پیاو دەبێتە دەریاچەیەکی ئارام و وێنەی ژنەکە پیشان دەداتەوە و

ژن دەبێتە دەریاچەیەك و پیاوەکە وێنەی خۆی تیا دەبینێتەوە. لە راستیدا نەك تەنیا

واقعیەتێکی تر پیشان دەدەن بەڵکو دەشیڕازێننەوە و بە هەزار و یەك شێوە جوانتر دەیخەنەڕوو. ئەمە شتێکە کە پێی دەڵێن عەشق. ئەمە عەشق نییە. ئەمە رازیکردنێکی دوولایەنەی نەفسە.

عەشقی راستەقینە هیچ لە نەفس ناناسێت. عەشقی راستەقینە هەر لەو سەرەتایەی بێ نەفسییەوە دەست پێدەکات.

تۆ بەشێوەیەکی سروشتی ئەو جەستەیەت، ئەو بوونەت هەیە و رەگت تیادا داکوتاوە. کەوایە چێژی لێ ببینە. دەوڵەمەندی بکە و ئاهەنگی پێوە بگێڕە. مەسەلەی لوتبەرزی یان نەفس لەئارادا نیە، چونکە تۆ خۆت بەهیچ کەسێك بەراورد ناکەیت. نەفس تەنیا بە بەراوردکردن دێتەناوەوە. عەشق بەراوردکردن ناناسێت. تۆ خۆت هەیت و هیچی تر. تۆ نالێیت یەکێکی تر لە تۆ نزمترە. تۆ هەرگیز بەراوردکاری ناکەیت. هەرکاتێك بەراورد هاتە پێشەوە، ئەوا بزانە عەشق بوونی نییە و فێڵ و شێوازی نەفس لەکایەدایە.

نەفس لە رێگەی بەراوردکردنەوە درێژە بە ژیانی دەدات. کاتێك بە هاوسەرەکەت دەڵێیت: (خۆشم دەوێیت) ئەمە شتێکە، بەڵام کاتێك بە ژنێك دەڵێیت: (کیلۆپاترا لە بەرانبەر تۆدا هیچ نییە) ئەمە شتێکی ترە. رێك خاڵی بەرانبەرە. بۆچی کیلۆپاترا دەهێنیتە ناو بابەتەکانەوە؟ ئایا ناتوانیت بەبێ باسکردنی کیلۆپاترا ئەم ژنەت خۆش بوێت؟ کیلۆپاترا بۆئەوە هاتووەتە بەر باس تا نەفس پف بدات و هیچیتر. پیاوەکەت خۆش بوێت. بۆچی باسی ئەسکەندەری مەزن دەکەیت؟

عەشق بەراورد ناناسێت. عەشق بەبێ بەراوردکردن خۆشەویستی دەکات. بۆیە هەرکاتێك بەراورد بوونی هەبێ بزانە کە لوتبەرزییەکی نەفسانی هەیە، خۆشەیدایی هەیە. هەرکاتێك کە بەراورد نەبوو، عەشق دەبێ، جا چ بەرانبەر خۆ و چ بەرانبەر ئەویتر. لە عەشقی راستەقینەدا پۆلێنبەندی بوونی نییە. عاشقەکان لەناو یەکتریدا دەتوێنەوە. لە عەشقی نەفسانیدا دابەشبوونی گەورە هەیە: دابەشبوونی عاشق و مەعشوق. لە عەشقی راستەقینەدا هیچ پەیوەندییەك نییە. با دووپاتی بکەمەوە: لە عەشقی راستەقینەدا هیچ پەیوەندییەك بوونی نییە، چونکە چیتر دوو تاکەکەس بوونیان نییە کە پەیوەندییان هەبێت. لە عەشقی راستەقینەدا تەنیا عەشق بوونی هەیە. پشکوتن، بۆنی خۆش، تووانەوە، دیدار بوونی هەیە، تەنیا لە عەشقی نەفسانیدایە کە دوو کەس بوونیان هەیە، عاشق و مەعشوق. هەر کاتێکیش عاشق و مەعشوق لەوێ بن، عەشق لەناو دەچێت. هەرکاتێك کە عەشقێکی راستەقینە بوونی هەبێت، عاشق و مەعشوق هەردووکیان بزر دەبن، عەشق دیاردەیەکی زۆر مەزنە. ناتوانیت بەبێ عەشق زیندوو بیت. عەشقی راستەقینە هەمیشە لە ئێستادایە. عەشقی نەفسانی هەمیشە یا لە رابردوودایە یان لە ئایندەدایە...

# بێ متمانەیی

پیاوێکی سکۆتلەندی چووە لای پزیشکی ددان تاوەکو ئەو ددانەی پیشان بدات کە ئازاری هەبوو. دکتۆر ددانەکەی پشکنی و وتی: (کەڵکی نەماوە، خراپ داڕزیووە، دەبێ بیکێشم و پێویستە بەنجت بۆ بکەم).

کابرای سکۆتلەندی بە سەرسوڕمانەوە وتی: (بێهۆش!)

دکتۆر وتی: (بەڵێ، بە گازی بێهۆشکەر. چەند خولەکێك خەوت پیا دەکەوێ و من دەتووانم ددانە رزیووەکە بەبێ ئازار دەربێنم).

پیاوەکە پرسی: (ئایا کاتێك بەهۆی گازەکەوە بێهۆش دەبم، ئاگام لە هیچ دەبێت؟)

(نا، ئاگات لە هیچ نابێت).

کابرای سکۆتلەندی کیسەباخەڵی ناو گیرفانەکەی دەرهێنا و دەستیکرد بە ژماردنی پارەکانی. دکتۆر وتی: (نا، پێویست ناکات ئێستا پارە بدەیت. دوای کارەکە کاتی پێویستمان هەیە حسابەکە بکەین).

(من نەمدەویست ئێستا پارەکە بدەم. تەنیا دەمویست پێش ئەوەی بێهۆشم بکەیت، دڵنیا بمەوە لەوەی چەنێك پارەم پێیە!)

**خەڵکی بەمشێوەیە دەژین...**

کێ تۆی دروستکردووە؟

قەشەی نوێ دەچووە مەراسیمی ناساندن، دایکەکە بە (ئیما)ی کچە بچـــوکـــەکەی وت: (ئەگەر ناوتی پرسی بڵێ ئیما جین، ئەگەر وتی تەمەنت چەندە بڵێ هەشت ساڵ، ئەگەر پرسی کێ دروستیکردوویت بڵێ خوا دروستی کردووم).
قەشەکە لەکاتی خۆیدا گەیشت. ئینجیل و کـــ- ڵاوەکەی بەلاوەنا و بەرەو لای ئیمای بچکۆلە چوو. دەستی بەسەریدا هێنا و لێی پرسی: (کیژۆلە ناوت چییە؟)
(ئیما جین)
(باشە، ئیما جین تەمەنت چەندە؟)
(هەشت ساڵ)
(ئۆی، زۆر باشە! ئیما جین ئەزانیت کێ تۆی دروستکردووە؟)
کیژۆلەکە چەند ساتێک وەستا و پاشان لە وەڵامدا وتی: (دایکم ناوی ئەو کەسەی پێ وتم بەڵام بیرم چووەتەوە!)
بەقەرز وەرگرتن لەوانیتر و فێربوون لە نەریتەکانەوە، مەعریفەی تۆ هیچ کـــاتێک نابێتە (مەعریفەی تۆ). تەنیا زیاتر و زیاتر دەبێتە مایەی گاڵتەجاڕیت. ئەمە ڕێگای عاریفەکان نییە.

مەسعود لەعلی

لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٣٠٠٠) دینار